# بەرەو هەڵسانەوەیەکی سەرلەنوێی چەپ

کەریم مروە

# بەرەو هەڵسانەوەیەکی سەرلەنوێی چەپ

وەرگێڕانی

د.ئەحمەد محەمەد ئابلاخی

**چاپی عەرەبی ئەم کتێبە لەلایەن _دار الساقی للنشر و الطبع —وە**
**کراوە بە سوپاسەوە ڕێگەیاندایین بە کوردی بڵاوی بکەینەوە**


**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **بەرەو هەڵسانەوەیەکی سەرلەنوێی چەپ**
- **نووسینی:** کەریم مروە
- **وەرگێڕانی:** د.ئەحمەد محەمەد ئابڵاخی
- **بابەت:** لێکۆڵینەوەی سیاسی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** هەرێم عوسمان
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٤) ساڵی ٢٠١٤ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨١٠)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك


**چەند دێرێك دەربارەی کەریم مروە ......................................... ٧**

**هەندێك سەرنجی پێویست لە بری پێشەکی ..................................... ١٨**

**بەشی یەکەم: چەپ لە جیهانی عەرەبیداو گۆرانکاریەکانی .............. ٣٥**

دەرگای یەکەم: چەپ و گۆڕانکاریەکانی سەردەم بەرەو ....................... ٣٧

دەرگای دووەم: نەهامەتییە ئابوورییە تازەکان و هەندێك لە ............... ٤٥

دەرگای سێیەم: بەرەو سیستمێکی جیهانی نوێ لەگەڵ ڕاگرتنی ............. ٥١

دەرگای چوارەم: کۆسپەکانی بەردەم دروستبوونی سیستمێکی .............. ٦٢

بەشی دووەم :بەرەو هەڵسانەوەیەکی سەرلەنوێی چەپ ..................... ٦٨

دەرگای یەکەم: پێشەکیەکی ڕەخنەگرانەی بنیاتنەرانە ....................... ٧٠

دەرگای دووەم: کۆڵەکە سەرەکییەکانی پڕۆژەی گۆڕان بە ناوی چەپەوە ...... ٨٩

دەرگای سێیەم: ئەرك و بابەتە ڕاستەوخۆکانی بەرنامەی .................... ٩٩

# چەند دێڕێك دەربارەی كەریم مروە

كەریم مروە لەدایكبوی ساڵی ١٩٣٠ زاینیە، لە شارۆچكەی (حـاریص) لە خواروی لوبنان لە دایكبوە كـە كەوتۆتـە لای سـەروی سـنوری مێـژویی فەلەستینەوە، لە بنەماڵەیەكی ئاینیی سەر بە مەزهـەبی شـیعەیە، بـاوكی پیاوێكی ئاینی ناسراو بوە ناوی (شێخ ئەحمەد مروە) بوە.

كەریم مروە لە تەمەنی هەشت سـاڵیدا قورئـانی خـەتم كـردوە و سـاڵی دواتر چـۆتە بـەر خوێنـدن لـە خوێیندنگایـەك كـە كۆمەڵـەی خێرخـوازیی (العاملیه) لە شارۆچكەكەیان كردبویەوە، لـە سـاڵی ١٩٤١ خێزانەكـەیان گواسـتیانەوە بـۆ شـاری (صـور) لـە خـواروی وڵات و لـەوێ كـەریم چـوە قوتابخانەی (الجعفریه) كە چەند سـاڵێك لەوەبـەر مەرجـەعی ئـاینی شـیعە (سید عبدالحسین شرف الدین)دایمەزراندبو،كـەریم لـەو قوتابخانەیـە قۆنـاغی سەرەتایی و تەكمیلی تەواوكرد و لە ساڵی ١٩٤٧ باوكی ناردی بـۆ عێـراق تا لەوێ لە ژێر چاودێری كوڕی مامی باوكیا خویندن تەواو بكات كە زانـای كەڵچەری ئیسلامی شـەهید (حسـێن مـروە) بو،كـە دواتـر بـەرگی ئـاینی داماڵی و خۆی دەستبەتاڵ كرد بۆ وتنەوەی وانـەی ئـەدەب و فەلسـەفە لـە خویندنگاكانی عیراقدا و نوسین دەربارەی بابەتە ڕۆشـنبیریەكان لـە گۆڤـارو ڕۆژنامەكاندا.

كەریم مروە لە ناو خێزانی حسین مروەدا لـە كازمیـە دانیشـتبون و تـا دوساڵ بەردەوام بو لە خویندنـدا لـە قوتابخانـەی (الجعفریـە) و (الاعدادیـە المركزیە)، لە كاتێكدا كـە ئـەو لـە عێـراق بـو ڕوداوی (الوثبـة) ڕویـدا كـە سەرەتاكانی ساڵی ١٩٤٨ بو ئەمیش لەو خۆپیشاندانانەدا بەشـداری كـرد،

کەریم مروە لە ماوەی ئەو دووساڵەی کە لە عێراقدا بو زۆرکەسی لە نوسەرە ناسراو و شاعیرەکانی عێراق ناسی،لەوانە (جواهری) و(سیاب) و (الملائکه)و (الحیدری) لە نوسەرەکانیش (محمد شراره)و(عبدالملك نوری)و (جعفر الخلیلی) و (عبدالقادر البراك) و (ذو النون ایوب) و(محمد حسن الصوری)

لە هاوینی ١٩٤٩ داو دوای شکستی ڕاپەرین و گەڕانەوەی سەرکوتکاری پێشوی سەردەمی مەلیکی جنسیەی عێراقی لە حسین مروە سەندرایەوە و ئەویش عێراقی جێهێشت و گەڕایەوە بۆ لوبنان و کەریم مروەش لەگەڵیان ڕۆشت، کەریم لەوسەردەمەدا لە عێراق بو کە سەرکردەکانی حزبی شیوعی عێراقیان ئیعدام کرد لەوانە (فهد) و هاوڕێکانی،کەریم سەردانی زۆر لەو ڕۆشنبیرانەی کرد کە لە بەندیخانەکان توند کرابون لەوانە (جواهری) کە پێشتر لە ئاهەنگی ڕێزلێنانی ڕاگری کۆلێژی پزیشکی (هاشم الوتری) ناسیبوی کە لە یانەی (المسبح) لە (کرادە مریم) سازکرابو کاتێك (جواهری) قەسیدەیەکی خویندەوە و هێرشی توندی کردە سەر هەمو دەسەڵاتدارانی حوکم و کەریم مروە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو.

کەریم مروە پاش ئەوەی لە عێراق گەڕایەوە بۆ لوبنان دەستبەجێ پەیوەندی کردەوە بە خویندنگای (الجعفریه) بۆ ماوەی ساڵێك و دواتر بۆ ماوەی دوساڵ بو بە مامۆستا لە قوتابخەنە رەسمیەکاندا، لە هەمان کاتیشدا بەردەوام بو لە خویندن بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئامادەیی، تا لە تاقیکردنەوەی ساڵی ١٩٥٢ دا دەرچوو ئیتر وازی لە وانە وتنەوە هیناو پەیوەندی کرد بە زانکۆی لوبنانیەوە بەشی ئاداب، لەو ماوەیەدا کە خوێنکاری زانکۆ بو هەڵبژیررا بە جێگری سەرۆکی یەکێتی (مەبەست

یەکیتی خویندکارانە – وەرگێڕ) بەو سیفەتەی کە شیوعیە، کە کەریم مروە پێشتر لە عێراق لە ساڵی ١٩٤٨ لە ژێر کاریگەری ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەی وڵاتانی عەرەب و جیهان بوبو بە شیوعی و بە خۆشی ئەو سەرکەوتنە گەورانەوە کە لەشکری سوری سۆڤیێتی بەسەر نازیەکان و فاشیەکاندا بەدەستی ئەهێنا و پێشتریش لە ژێرکاریگەری نوسینەکانی (جبران خلیل جبران) و (مخائیل نعیمه) و (أمین الریحانی) و زۆر لە نوسەرە فەرەنسیە ناسراوەکاندا بو کە ئەمانە هەمو بە ڕوانگەیەکی شۆرشگێڕانەو سۆشیالستانە بە ناوی بیروباوەڕی شۆڕشی فەرەنسیەوە ئەیاننوسی لەکۆتاییی ساڵی یەکەمی خوێندنی زانکۆدا سەرکردایەتی حزبی شیوعی هەڵیان بژارد کە بچێت بۆ مەجەڕی سۆشیالستی بە نوینەرایەتی لاوانی عەرەبی لە سەرکردایەتی یەکێتی لاوانی دیموکراتی جیهانی کە بارەگاکەیان لە بۆدابست بو،لەو ماوەیەدا کە لەوێ بو زۆر لە لاوانی پیشەوای وڵاتە عەرەبی و جیهانیەکانی ناسی لەوانە لاوی چەپڕەو (جەلال تاڵەبانی) لە کاتی فیستڤالی جیهانی چوارەم بۆ لاوان و قوتابیان کە ساڵی ١٩٥٥ لە وارشۆ سازدرابو، لەو کاتەوە کەریم مروە نزیکی لەگەڵ کێشەی کوردا پەیدا کرد و لە گەڵ رۆژگاردا پەیوەندیەکەی زیاتر بو،لای خۆشیەوە دایئەنا بە یەکێك لەو کێشە ئینسانیانەی کە لەیادی دور نەئەکەوتەوە و شانبەشانی کێشەی فەلەستین دای ئەنان بە هێمای کێشەی سەربەستی مرۆڤ و گەورەترین بەهای مرۆڤ لەسەر ڕوی زەوی کە بە قەناعەتەوە لە هەمو نوسینەکانیا ڕەنگی داوەتەوە

کەریم مروە ساڵی ١٩٥٧ گەڕایەوە بۆ لوبنان دوای ئەوەی کە ئەرکەکەی تەواو بو لە یەکێتی لاوانی دیموکراتیی جیهانی،لە سەرەتادا بو بە موحەرر لە ڕۆژنامەی (النور) کە حزبی شیوعی لوبنانی و سوری لە (دیمشق) بە

سەرۆکایەتی (فرج الحلو) دەری ئەکرد، کاتێك کە شۆڕشی شەعبی لە لوبنان دەستی پێکرد لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ بە هاوکاری (فرج الحلو) ولـە ژێـر چاودێری ئەودا رۆژنامەی (النداء) یان دەرکرد کە زمانحاڵی حـزب بـو،دواتر بوە سەرنوسـەری بـۆ مـاوەی شـەش مـانگ لـە سـاڵی ١٩٦٠دا، دواتـر گوێزرایەوە بـۆ پلـەی جێگـری بەرپرسـی سـەرکردایەتی رێکخـراوی حزبـی شیوعی لە بەیروتی پایتەخت و دەوروبەریدا

لە سەرەتای سـاڵی ١٩٦٢ دا داوای لێکـرا کـە بچـێت بـۆ (ڤینـا) بـە نوینەرایەتی جوڵانەوەی ئاشتیخوازی عـەرەبی لـە سـەرکردایەتی دەسـتەی ئاشتیخوازیی جیهانی و هەڵبژێررا بە ئەندامی دەسـتەی گشـتی، ئـیتر لـە (ڤینا) مایەوە تا کۆتایی ساڵی ١٩٦٤،دوای ئـەوە گەڕایـەوە بـۆ لوبنـان و یەکسەر بو بە ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی حزبـی شـیوعی لوبنـانی کـە ئەوکاتە لە حزبی شیوعی سوری جیا بوبـوەوە و لـەو پۆسـتەدا مایـەوە تـا ساڵی ١٩٩٢ کە کۆنگرەی شەشەمی حزب گیرا لە ئەنجامی جـەنگی نـاوخۆ لە لوبنان

کەریم مروە ئامادەی کۆنگرەی شەشەم بو لەگەڵ نیـازی دورکەوتنـەوەی وردە وردە لە بەرپرسیارێتی حزبـی، لـە کـۆنگرەدا هەڵبژێررایـەوە بـە بـێ بەرپرسیایەتێکی دیاریکراو، ئیتر خۆی خەریك کرد بە سەرپەرشـتی کردنـی دەرکردنەوەی گۆڤاری (الطریق) کە سـاڵی ١٩٩١ لـە کـار وەسـتابوو، ئـەو سەرپەرشتی کردنە تا ساڵی ٢٠٠٤ بەردەوام بو ئیتر گۆڤارەکـە وەسـتا، لـە کۆنگرەی هەشتەمی حزبدا کە لە ساڵی ١٩٩٩ گیرا لە حزب دورکەوتەوە .

ئەوەی ئاشکرایە کەریم مروە لە نەوەی گەنجانە لە پێشـڕەوایەتی کردنـی حزبدا کە هەستان بە ئەنجامدانی شۆڕشی نوێکردنەوە لـە سـاڵی ١٩٦٦ دا لە فکرو سیاسەتی حزبـدا و وینـەی سیاسـەتێکی هاوسـەنگییان لـە گـەڵ

یەکێتی سۆڤیەتدا کێشا و بێلایەنانە لە نەخشە کێشانی سیاسەتی حزب سەبارەت بە کێشەکانی لوبنانی و جیهانی عەرەبی لە هەمان کاتدا پەیوەست بە مەسەلە ئومەمیەکان بە پیشڕەوایەتی کردنی یەکێتی سۆڤێت کە ئەوە ئەرکێکی گران بو بەڵام گەنجان لەو شۆڕشەیاندا سەرکەوتو بوون، ئەوەش لە کۆنگرەی دوەمی حزبدا رەنگی دایەوە کە لە هاوینی ١٩٦٨ دا بەستراو بو بە بڕیاری کۆنگرە، هەر ئەو بڕیارانە سیاسەتی حزب و هەڵوێستی حزبی پتەو ڕاگرتبو تا هاوبەشی کردن و چونەناو شەڕی ناوخۆوە کە بوە هۆی ئەوەی حزب بهاوێتە ناو زەلکاوێکەوە کە ڕەونەقی حزبی تیا ونبو ئەو ڕەونەق و کەسیەتیەی کە هەیبو بە پێی بڕیارەکانی کۆنگرەی دوو سێ کە حزب پێی بە ناوبانگ بوو،لە پەیوەندیە ناوخۆییەکان و عەرەبیەکان و جیهانیەکاندا و پێگەیەکی دیاری پێدابوو، ئەمەش ئەو ڕەخنە لە خۆگرتنە دیارەی کەریم مروە بوو کە بەردەوام جەختی لەسەر ئەکردەوە لە نوسینەکانیدا هەر لە سەرەتای دوا قۆناغی شەڕەوە و بە تایبەتی قۆناغی دوای وەستانی شەڕ

کەریم مروە لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە دەستی کردوە بە نوسین لەسەر کێشە فکریەکانی پەیوەست بە سۆشیالیستییەوە و پاشەڕۆژیان لە وڵاتە عەرەبیەکاندا، ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە گۆڤاری (الطريق) دا لە ساڵی ١٩٨٤ دا نوسیبوی بە بۆنەی تێپەڕبونی سەد ساڵ بەسەر کۆچی دوایی مارکس دا لە ژێر ناونیشانی (قەیرانی مارکسیەت لە وڵاتە عەرەبیەکاندا) بوە هۆی هەڵگیرسانی گەلێك لێکۆڵینەوە و موناقەشەی گەرم لە ناوەندی چەپی عەرەبییدا،ئەو لێکۆڵینەوەیە هەندێك گۆڤاری تریش بڵاوی کردەوەو چەند جارێکیش بە شێوەی نامیلکە لە دەرەوەی لوبنانیش لە چاپ درا

کەریم مروە بە هەرچوار لای جیهاندا سەفەری کردوە بۆ زۆر ئەرکی جیا لەوانە : نوێنەرایەتی کردنی یەکێتی لاوانی دیموکراتی جیهانیی ونوینەرایەتی کردنی دەستەی ئاشتیخوازیی جیهانیی ونوێنەرایەتی کردنی حزبی شیوعی لوبنانی وگەلێك سەفەری تایبەتیش، لەگەڵ زۆر لە سەرۆك ولاٌتەکان بەیەك گەشتوەو زۆر لە پیشڕەوان و سیاسیەکان و سەرکردەی حزبەکان و زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەو ولاٌتانەی بینیوە و لە زۆر کۆڕو کۆبونەوە وکۆنگرەی ڕۆشنبیری عەرەبی و بیانیدا بەشداری کردوە .

کەریم مروە لە پێگەی حزبی خۆیدا سور بوە لەسەر پێکهێنانی پەیوەندی توندو تۆڵ بە ژیانی ڕۆشنبیرییەوە لە لوبنان و جیهانی عەرەبی وبەشداری زوربەی چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی کردوە و هەر ئەمەش وای کردوە برێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی ولاٌتانی عەرەبی و هەندێك لە ولاتانی ئەوروپی بناسیٚ و ببنە هاورێی،هەروەها لەگەڵ ڕۆشنبیرانی عێراقییشدا، یەکێك لە خەونە دێرینەکانی ئەوەبوە سەردانی کوردوستان بکات، ئەوەشی لە ساڵی ٢٠٠٠دا بۆ ڕەخساوە لە گەڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری عەرەبدا، هەر واشی دائەنێت کە بناغەی کەسێتی ئەو کە لکاوە بە ناوەکەیەوە لە عێراقەوە دروست بوە، بۆیە عێراق بە ولاٌتی دوەمی خۆی ئەزانێت، لە و هاورێیەتیانەش کە شانازی پێوە ئەکات هاورێیەتیەتی لەگەڵ سەرۆك مام جەلال و سەرۆك مەسعود بارزانی و ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردە شیوعیەکانی عێراق و سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردوستان و پارتی دیموکراتی کوردوستان وحزبی نیشتمانیی دیموکراتی کە کامل چادرچی سەرۆکایەتی ئەکرد.

جگە لەم کتێبەی بەردەستتان کەریم مروە ئەم بەرهەمانەی خوارەوەشی بە چاپ گەیاندوە بە زمانی عەرەبی

- كيف نواجه الأزمة

في حركة التحرر الوطني العربية (١٩٧٤)

- المقاومة

أفكار للنقاش حول الجذور والتجربة والآفاق (١٩٨٥)

- حوارات

مفكرون عرب يناقشون كريم مروة

في القومية والاشتراكية والديمقراطية والدين والتراث والثورة (١٩٩٠)

- حوار الأيديولجيات

بين أفكار ماركسية وأفكار دينية (١٩٩٧)

- نحو جمهورية ثالثة (٢٠٠١)
- كريم مروة يتذكر فيما يشبه السيرة (٢٠٠٢)
- عشية أفول الأمبراطورية (٢٠٠٣)
- في البحث عن المستقبل (٢٠٠٨)
- الشيوعيون الأربعة الكبار

في تاريخ لبنان الحديث (٢٠٠٨)

- نحو نهضة جديدة لليسار في العالم العربي (٢٠١٠)
- قادة تاريخيون كبار في ثورات القرن العشرين- من جزئين(٢٠١١)
- فلسطين وقضية الحرية (٢٠١٢)

## هەندێك سەرنجی پێویست لە بری پێشەكی

دوای شكستی ئەزموونی سوشیالستی لە یەكێتی سۆڤێتداو دوا بەدوای ئەویش شكستی هەموو حزبە شیوعیەكانی وولاتانی تر لە ئەوروپا و رۆژهەلاتی ناوەراستدا، نیمچە چەق بەستنێك دروست بوو وەك ئەوەی هەموویان گوللەیەكی سربونیان پێوەنرابێت . روخانی یەكەم ئەزموون لە یەكێتی سۆڤیەت شەرمەزاریەكی بە رویانەوە دروستكرد لە بەرامبەر جولانەوە سەرمایەدارییەكاندا كە ئەلف و بێیەكیش دەربارەی هوكارو ئاكامەكانی ئەو هەرەسە لەلایەن رۆشنبیرانی ئەو رێبازەوە نەخرایە روو،هەرچەند لادانی دەسەلاتدارانی ئەو ولاتە لە لای زۆر رۆشنبیری ماركسی ئەو روخانەی لێ چاوەروان ئەكرا . وولاتانی ئەوروپای رۆژئاوا هەندێك ئابروی خۆیان كریەوە بە پیادە كردنی رێرەوی سۆشیال دیموكرات و تائێستاش زۆریان بەردەوامن . كاتێك ئەم كتێبەی نوسەرو روناكبیر كەریم مروەم خوێندەوە (گەورە پێشرەوی فكری شیوعی لە لوبنان) . هەستم كرد حەزو گروتینی ئەو رێبازە لە شادەماری هەندێك كەسدا ماوەو پل ئەدات . من بۆ خۆم قەناعەتم وابوو كە ماركسیزم بە گوێرەی ئەم سەردەمەوئەزمونی تازەی جیهان لێكۆڵینەوەو نویێ كردنەوەی دەوێ و بەرەو پێش چوونی مێژو ئەویشی كۆن كردووە و پێویستی بە خستنە سەرو لێفرێدان هەیە و پێویستە پەیوەست بكرێت و بگونجێنرت لەگەڵ سەردەمە مێژوییەكەدا .ماركس و لینینیش كە پێشتر لە قۆناغەكانی تێكۆشانی چینی كرێكاردا باسیان لە هاوپەیمانی كردوە لە گەڵ هێزە نیشتمانیەكاندا، رەنگە ئەو حسابە وردەیان بۆ ولاتە ئیسلامیەكان نەكردبێت كە ئەوان تا سەر ئێسقان جولانەوەی چەپ

به تایبەتی سۆشیالستی و شیوعیەت بە دوژمنی دینەکەیان ئەزانن و هەردەم بەرهەڵستی بوون ودژی گەشەکردنیان بوون، تەنانەت هاوپەیمانی لەگەڵ هێزە نیشتمانیەکانی تر کە لە هەوڵی خەباتێکی رزگاریخوازی گەل و نیشتماندان بە پێی ئەزمونەکان لە حاڵەتێکدا ئەبێت کە هێزی چەپ و سۆشیالستەکان نابیَ وەك ژمارە و وەك هێز و توانا لەوان کەمتر بن،نەك بە حسابی برا بچوکی و کەی بیانەوێت دایانپڵۆسن، ئەزمونی کوردوستانی عێراقیش (حزبی شیوعی عیراق و حزبەکانی یەکێتی و پارتی) ئەو ڕاستیەی سەلماندوە کە بەردەوام وەك پەناهەندە و بندەست سەیریانکردون و ناوچەی جوڵانەوەیان بۆ دیاری کردون زۆرجاریش پەلاماریان داون .

لە ڕوی ئابوریشەوە ئەو سەردەمەی مارکس کتێبی (سەرمایە)ی نوسیوە هیچ حسابێکی بۆ وڵاتانی نەوت نەکردوەو تیورەکانی بۆ ئەو وڵاتانە نایەتەوە،کە ئێستا خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی تازە هەیە بە ناوی (ئابوری وڵاتانی نەوت) کە ناچنە ژێر خویندنەوەو حسابی خستنە بازاڕ وداوای کاڵاو شتومەك و تەرازوەکانی داهات و خەرجی وڵات و کاریگەری بەسەر داهاتی تاکە کەسەوە،کە ئەمانە هەموی کار ئەکاتە سەر دیاری کردنی چینەکان جیا لەو دابەشکردنەی کە مارکس کردویەتی . هەر لەو ڕوانگەیەوە بەو هیوایەی بۆچونەکانی خۆم لە دوتویێ ئەم کتێبەدا بدۆزمەوە بۆ جاری دووەم وردتر خوێندمەوە و هاتمە سەر بڕیاردانی وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی . ئەوەی کە لە دوو تویێ ئەم کتێبەدا سەرنجی ڕاکێشاوم و لە سەدا سەد لەگەڵی بووم ئەم حاڵەتانەی خوارەوەیە .

١ – سەرمایەداریی گلۆبالێزم کە هەموو دنیای گرتۆتەوە . پێویستی بەبەرەنگاربونەوەیەك هەیە کە تەنها ئەرکی چینی کرێکار نییە .

٢ – چەپی نوێ تەنها چینی کرێکار نییە و مەفهومی پرۆلیتاری گۆڕاوە لەبەر ئەوەی پرۆسەی بەرهەمهێنان گۆڕاوە و زۆر بواری تردورست بوە بۆ چەوساندنەوە .

٣ – چەپ پێویستە پێش هەموو شتێك بارودۆخی وولاتەکە دراسە بکات پێش جولانەوە

٤ – چەپ ئەبێ حساب بۆ سەردەمە میژوییەکان بکات کە تیا ئەژی .

٥ – چەپ پێویستە ڕابردو بخوێنێتەوە نەك هەر لە پێناوی ڕەخنە گرتن، بەڵکو لە پێناوی ئەوەدا کە ئەزمونی ڕوخاوی چەپ بکاتە وانەیەك و هەوڵ بدات دوبارەی نەکاتەوە .

٦ – ئەولەویەتی چەپ بە گشتی (چینی کرێکارو سەرجەم توێژەچەوساوەکانی ترو هێزە نیشتیمانیەکان) پێویستە دەوڵەتێکی دیموکراتیی ڕاستەقینە پێك بهێنن و دواتر لە سایەی دیموکراتیەتدا چەپە سۆشیالیستەکان لە هەولی خۆیان بەردەوام بن بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی سۆشیالیستی .

ئەوەشی کە بە گومانم لێی و وای بۆ ئەچم کە پێویستی بە لێکۆلینەوەی قولتر هەیە .ئەوەیە کە نوسەری ئەم کتێبە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ڕەت ئەکاتەوە بەو بیانووەی کە دیکتاتۆریەت هەر دیکتاتۆریەتە جاهی کرێکار بێت یان هەر چینێکی ترو بە پێویستی ئە زانێ کە ئەو دەستە وا ژەیە بگۆڕێ بۆ شێوازێکی تر و ڕژێمێك بەرهەم بهێنێ کە هەموو چینەکان لە سایەیدا هەست بە ئازادی و عەدالەتی کۆمەلایەتی وادپەروەری بکەن .

ئەوەشی کەلەگەلیا نیم ئەوەیە کە نوسەر باس لە پێکهێنانی بەرەیەك ئەکات دژی دەسەلاتە سەرکوتکەرەکان،کەبەڕای نوسەر ئەو بەرە چەپە نوێیە ئاساییە ئیسلامی سیاسیاشی تیابێت،مادەم هەست بە چەوساندنەوە

ئـەكات و دژی دەسـەڵاتێکی چەوسـێنەر تێئەکۆشـێت . بـەڕای مـن ئـەم خاڵەیان وریاییەکی زۆرتری ئەوێت،بە تایبەتی کەئێمە ڕابردویەکی نزیکمـان لە بەردەستایە، شۆڕشی ئێران دژی محەمەد ڕەزا شـا لـە سـالی ١٩٧٩ لـە لایەن چەپی ئەو وڵاتەوە دەستی پێکردو هەموو هێـزە پیشـکەوتنخوازەکان بەشداریان تیا کـرد، بـەڵام بـەوە شـکایەوە کـە ئیمـام خومـەینی سـودی لەفراوانی بنکـەی ئیسـلامی ئـەو وڵاتـە وەرگرتو،ئەنجامەکـەی قۆسـتەوەو چەپەکان لە ئەنجامی شۆڕشەکە نەك هەر بێبەری بوون بـەڵکو دەربـەدەریش بـوون ،هەنـدێك ئـەزموونی ئـەم دواییـەی وولاتـە عەرەبیەکانیشـمان لەبەردەستایە،بە هەمان شێوە ئەو بەرەیەی کە لە لیبیـا ڕاپـەری و ئـەوەی تونس و ئەوەی میسر و ئەوەی ئێستای سوریاش هەمویان هـەر ئیسـلامیی نەبوون،بەلاَم لەبەرفراوانی بنکەی جـەماوەی ئـەوان (حزبـە ئیسـلامیەکان) وەك ئـەبینین لەهەڵبژاردنەکانـدا ئەیبەنـەوە . کەئـەوانیش سـەرئەکەون و دەسەڵات ئەگرنە دەست ئەو کاتە تێکۆشانی چەپ زۆر قورسـتر ئـەبێت کـە ڕەنگە لەو سەردەمەی پێش ئەوان قورستربێت،بەتایبەتی بە نیسبەت چـەپە سۆشیالیستەکانەوە . بە ڕای من ئیسـلامی سیاسـی کـە دەسـەڵاتی گرتـە دەست ئومێدی پیکهینانی دەوڵەتی دیموکراتی لێناکرێت .

وەرگێڕ

## پیشکەشکردن

ئەم کتێبە هەوڵێکە، تەنها هەوڵ، کە هەندێك بیروڕای خۆمی تیا پێشکەش ئەکەم بە پێی تاقیکردنەوە و ئەزموونی دوور و درێژی خۆم لە بواری سیاسەت و فکردا بەناوی چەپ و لە سنووری چەپدا، هەوڵ ئەدەم ئەم بیروڕایانەش بەشداریکردنێك بێت لە پێشکەشکردنی بۆچونێکی تازە دەربارەی چەپ لە وڵاتی ئێمەدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەرئەنجامەی تێکشکان و بەرەودواوە چوون وئەو کارەساتانەی کە لەم دواییەدا چەپ بە خۆیەوە بینی لە دنیای سەردەمدا ،دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤێت و ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستیی، خاڵی دەستپێکردن لای من پێشکەشکردنی بیروڕایەکە دەربارەی سەرلەنوێ هەستانەوەی چەپ، لەو ڕوانگەیەوە کە ئەو بەرەودواچوون و کارەسات و ڕووخانەی چەپ، کە هۆکاری مێژویی کۆن و نوێی هەبووە، ئیتر کۆتایی مێژوو نەبووە و نابێت، کە ئەمە ئەڵێم ئەزانم کە بە ناوی سەرمایەداریی و ڕژێمەکەیەوە هەبوون خۆیان بۆ ئەمە تەرخانکردووە و ئەم جۆرە بۆچونەیان داڕشتووە بۆ سەردەمی دوای ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستی، بەڵام مەسەلەکە بەم

جـۆرە نەخشـە بۆکێشـانە چـواردەور ناگیرێـت، نەبـە قبـوڵکردن و نەبـە ڕەتکردنەوەش، ئەوەی بە شێوەیەکی سەرەکی لای من درووست بوە بە پێـی بۆچون و خویندنەوەی خۆم بۆ ئـەو گۆڕانکاریانـە،دەربارەی گـەڕان بەشـوێن چۆنیەتی دەربـازبوون لـەو نەهامەتیـەی کـە بـەهۆی ڕووخـانی ئـەزموونی سۆشیالستیەوە کەوتبووەوە، لە سـۆڤیتی نموونـەو هـەمو ئـەو قوتابخانـە و ڕێڕەوانەی هەموو وولاٌتانی تری جیهـان، بـەلاٌم دەرچـوون لـەو نەهامەتیـە مەرجدارە،کە بە ڕای من دوو مەرجی گرنگ هەیە ئەوانیش :

مەرجی یەکەم : هەستانەوەی هێزی چەپە کۆنەکان بـە تایبـەتی ئەگـەر توانرا، هێزێکی نوێی تریش بچێتە پاڵ چەپ، ئەگەر هەستی کرد بەوەی کە ڕۆڵێکی مێژوویی گرنگ چاوەڕوانێتی، ئەم هێزانە هەموویان دەسـت بکـەن بە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی مەوزوعی

بۆ ڕووداوە مێژووییەکانی کۆن و تازە کە گرنکترینیان یەکـەم ڕووداوە لە مێژوودا کە ئەویش ڕووخانی یەکەم ئەزموونی سۆشیالسـتییە، ئامـانجی یەکـەم لـەم خوێندنـەوە ڕەخنەییـە زانـین یـا هەوڵـدانی زانینـی هۆکـارە مەوزوعیەکان و هۆکارە پەیوەندیدارەکانە کـە بوونـە هـۆی ڕووخـانی ئـەو ئەزموونە سۆشیالستییە،بەلاٌم ئامـانجی دووەم و گـرنگتر تـەواوکردنی ئـەو زانیارییە یا هەوڵدانی بەدەستهێنانی ئـەو زانیارییـەی کـە مـارکس پـێش هەمووکەس هەستی پێکردووە، یا ڕۆشنبیرانی هاوچەرخی تـر گەیشـتونێتی دەربارەی هەڵیـەنجانی ئـەو یاسـا مەوزوعییانـەی کـە ئـەو حوکمـەی داوە (حوکمی ڕووخانی یەکەم ئەزموونی سۆشیالسـتی – وەرگێڕ)وتـا ئێسـتاش تەحەکوم بە سووڕانی مێژووەوە ئەکات چ لە ڕابردوو و چ لە ئێستاشدا

ئەمە بە هەردوو دەرئەنجامەکەیەوە ئەبێتە هۆی ئـەوەی کـە هۆکارەکـان بزانین و لایەنەکانی لێکبدەینـەوە، هۆکـارە بابەتیـەکان کـە پەیوەنـدی بـە

بەڕێوەبردنی مرۆڤ و ئاستی هۆشیارییانەوە هەیە، کە بۆتە هۆی خولقاندنی ئەو کارەساتە مێژووییەی کە ئێمەی مرۆڤ ناتوانین خەونە بەردەوامەکانی خۆمانی تیا بەدیبهێنین دەربارەی سەربەستی و پێشکەوتن و بە دیهێنانی یەکسانی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی، ئەو خەونانەی کە زۆرن ولە مێژووی کۆن و نوێدا جوڵانەوە فکری و کۆمەڵایەتییەکان باسیان لێوە کردووە، پڕۆژەی سۆشیالستی کە پەیوەست بوە بە فکری مارکسەوە بۆ پڕۆژەی گۆڕینی جیهان، یەکێك بووە لەو جوڵانەوانەی کە لە هەمووان زیاتر پەیمانی بە دەستهێنانی ئەو خەونانەی داوە،لە هەمووشیان زیاتر پشتبەست بووە بە نێوەندە جیاوازەکانی زانست، ئەمە ئەو مەرجە یەکەمە بوو بۆ دەربازبوون یا هەوڵی دەربازبوون لەو قەیرانەی کە ئەمڕۆ لە وڵاتی ئێمە و لە وڵاتانی جیهاندا چەپی تێکەوتوە

بەڵام مەرجی دووەم ئەوەیە کە ئەو هێزە نوێیەی چەپ بە تایبەتی هەستێت بە خوێندنەوەیەکی دوور لە ئایدۆلۆژیا، یاوەکتر بڵێین بە بێ پێشینەی بیرووباوەڕ، خویندنەوەیەکی وا بێت کە بتوانێ بەووردی و بابەتیانە و هەستیارانە قوڵببێتەوە بۆ ناو ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕویداوە و ڕوئەدات لە جیهانی سەردەمدا، لە ڕووی ئەو ڕووانینە جیاوازو دژ بەیەکانەوە کە لە نێوانیاندا هەیە، تا بتوانێ پوختەیەك بنیات بنێ یا هەوڵی بنیاتنانی بدات، کە ئەویش ئەرکی گرنگی ئەوخوێندنەوەیە ئەوەیە کە ئەو تۆخمانە پێشکەش بکات کە چەپی نوێ پێویستە گرنگی پێبدات، و پشتی پێببەستێ بۆ دیاریکردنی ئامانجە واقعیەکانی و چۆنیەتی بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە.

ئەوەی پێویستە لە بیرم نەچێت لەم ڕووەوە تەئکیدی لەسەر بکەم، ئەوەیە کە بیروباوەڕی مارکس و مارکسیزمی کلاسیکی کە چەپ لە وڵاتی

ئێمەدا پشتی پێبەستبوو بۆ بنیاتنانی پرۆژەی سۆشیالستیی سەردەمانە، لە زۆر ڕووەوە بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەت، بۆیە پێویستە سەرلەنوێ بیرمان داڕێژینەوە، لە بەر ڕۆشنایی پێویستییە بنەڕەتیەکانی فکری مارکس و مارکسیزمی کلاسیکیدا، کە پێویست بەوە ناکات لێرەدا ئەوە دووپات بکەینەوە کە پێویستە بیرکردنەوەمان و پرۆژەکانمان پەیوەست بێت بە سەردەمەکەوە کە لە کۆنەوە ڕێچکەی بەستووە و تێیدەپەڕێنێت، مێژوو تەواوکردنێکی بەردەوامە و بچڕان لە ڕووداوەکانیا نییە،بۆیە ئەو بەردەوامیەش لە بیرو نوێبونەوەیدا هەر پەیوەستە و لە ناو کۆندا لەدایك ئەبێت، لێوەی وەرئەگرێت،بەلاَم دوای لە دایکبوونی بونەوەرێکی سەربەخۆیە و کەسێتی تایبەتی خۆی هەیە و خەسڵەتی تایبەتی مەرجداری پەیوەست بە سەردەمەکەیەوە هەیە، بابەتیانەش ناتوانێ ئینکاری ئەوە بکات کە پەیوەستە بە مێژووی کۆن و بیرکردنەوەی ڕابردوو،کە هەر ئەوانەش بوونەتە هۆی پێشکەوتن بە هەموو ماناکانیەوە لەڕووی زانستی ومەعریفی وئابوری و کۆمەلاَیەتی و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتیەوە .

ئەگەر لێرەدا بمانەوێ ئاماژە بکەین بۆ ئەو پێشکەوتنانەی کە هەندێك ڕووداوی گەورە لە مێژوودا دروستی کردووە و ئەو بیروباوەڕانەی پەیوەندیدار بوون، لە هەمان کاتدا ئەوە نە ئەکرێ و نە لە تواناشمدا هەیە ئەوە پشتگوێ بخەم کە زۆر ڕووداوی گەورە و بیروباوەڕی گەورەی پەیوەندیدار هەیە بە پێچەوانەی جوولاَنەوەی پێشکەوتنەوە ئەڕوات، و تائێستاش لەم سەردەمەی ئێستاشماندا لەو جۆرە بیرکردنەوانە و ڕوداوانە لەدایك ئەبێت و پەیوەستە پێوەی و بزوێنەریشە بۆی، بۆیە خوێندنەوەی مێژوو بە هەموو جیاوازیەکانیەوە ئەرکی چەپەکان قورس ئەکات لە گەڕاندا بە دوای پرۆژەی نوێبونەوەی چەپدا، لە هەمان کاتیشدا خۆ تاودانێکی

گەورەیە لە ئەستۆی چەپدا کە ئەبێ هەر پێی هەستن، ئەوەی گرنگە بەلای منەوە لەو جۆرە بیرکردنەوانە و بابەتە پەیوەندیدارەکان بە ڕابردوو و داهاتووەوە، ئەوەیە کە خوێنەر لەوە ئاگادار بکەم کە من نە لەم پێشەکیە و نە لە کتێبەکەشدا بانگەشەی ئەوە ناکەم کە وەڵامی ئەو پرسیارە گەورانەم دابێتەوە کە نەهامەتیە گەورەکانی ئێستای چەپ درووستی کردوە،بەڵام لەم پێشەکیەدا، پێش پێشکەش کردنی بۆچوونی خۆم دەربارەی چەپی نوێ لەم وڵاتانەی خۆماندا،هەوڵ ئەدەم ئەو ڕوداوە گەورە مێژووییانە بهێنمەوە یاد لە گەڵ ئەو بیروباوەڕانەی کە بوونە هۆی ڕوودانیان و ئەو بیروو باوەڕانەش کە بوونە دەرئەنجامی، کە بەلای منەوە ئەو بیروباوەڕانە بەشێکن لە ڕێڕەوی جوڵانەوەی مێژوو، کە ئەڕوانیت بە سەر ئەوەی کە پێشکەوتن و سەربەستی و ئاسودەیی بۆ مرۆڤ بەدەست بهێنێ، مەبەستیشم لە یادخستنەوەی ئەو ڕوداوانە بە تایبەتی ئەوەیە کە پێداگرم لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕێگە دوور و درێژەی مرۆڤ گرتوویەتیە بەر لە پێناوی بەدیهێنانی ڕزاگاریدا درێژەی هەیەو ناپچڕێت ، کە ئەوەش تێکۆشانێکە بە ڕێگەو بیرکردنەوەی جیاواز لە لایەن ئەوانەوە کە پێی هەستاون، هەروەها ئامانجی دیاریکراوی جیاوازیشی لە پشتەوەیە لە کات و شوێنی خۆیدا، بە گوێرەی ئەو جیاوازیانەش شێواز و ئامڕازی جیاوازی هەیە، چەند جۆرێکیش لەبەرژەوەندی ئەو هێزانە هەیە کە پێی هەستاون، هەروەها چەند جۆرێکیش هۆکار هەیە کە بوونەتە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو جوڵانەوانە، کە هەندێك لەو هۆکارانە سەبارەت بەو هێزانە لە یەك ئەچن و هەندێکیشیان لە هەندێ ڕووەوە جیاوازن، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە سەرنەکەوتوون، بە پێویستم زانی ئەم خوێندنەوەیە بۆ ڕوداوە مێژووییەکان بە وەستان لە سەر شۆڕشی کۆیلەکان دەستپێبکەم بە سەرۆکایەتی سپارتاکۆس لە ئیمپراتۆریەتی

ڕۆمانیدا، ئەو شۆڕشە، بە پێی زانیاریەکی سنورداری خۆم لە بارەی ڕووداوە مێژووییەکانەوە، یەکەم شورشە کە کۆیلە چەوساوەکان پێی هەستاون لە پێناوی ڕزگاربوون لە زولْم و زۆر و چەوسانەوە و لە پێناوی بەدەستهێنانی سەربەستیدا، بەلاّم ئەوشۆڕشە سەرکەتنی بەدەست نەهینا و نەگەشتە ئامانجەکانی، هەرچەندە زۆری خایاند و زۆریش فراوان و گەورە بوو، هۆکاری سەرنەکەوتنیشی ئەگەڕێتەوە بۆ خۆی، وەکتر بلْێین هۆکارەکەی چۆنیەتی مومارەسەکردنی ئەو سەربەستیە بوو کەبەدەستیان هێنابوو.

ئەم کۆیلانە لە شورشەکەیاندا هەمان شێوازیان پیڕەو ئەکرد کە چەوسێنەرەکانی خۆیان و جەلادەکان ئەیانکرد، ئەمان وەك چەوسێنەر ڕەفتاریان ئەکردو زولْم و زۆریان ئەکرد، ئەمەش وایکرد کە جیاوازییان نەبێت لە خاوەن کۆیلەکانی پێشوو، ئەمەش داردەستێکی باشبوو بۆ نەیارەکانیان کە بەکاریبهێنن بۆ ڕووخاندنی شۆڕشی کۆیلەکان،ئەمە ئەوەبوو کە من لە خوێندنەوەی خۆم لە دووتوێی کتێبدا دەربارەی ئەو شۆڕشە تێیگەشتووم، ئەوەی زیاتر لە مێشکی مندا بنجی داکوتاوە و ماوەتەوە لەوبارەیەوە ئەو لێکۆلینەوانەبوو کە (تەها حسێن) لە گۆڤاری (الکاتب المصری) دا لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردودا بلاّوی ئەکردەوە بە ناونیشانی (بین الثورتین) کە تیایدا بەراوردی شۆڕشی سپارتاکۆسی ڕۆمانی و زنجیە موسولْمانەکانی ئەکرد، تەها حسین لە دوتوێی ئەو لێکۆلینەوە مێژووییە گەورەیەدا باسی گرنگی ئەو دوو شۆڕشە و هۆکارەکانی ڕوخان و سەرنەکەوتنیانی ئەگێرایەوە بۆ هۆکاری ناوخۆیی و دەرەکی، ئەوەی ئاشکرایە مێژووی کۆنی ناوچەکە هەلْگیرسانی زۆر شۆڕشی لەو جۆرەی سپارتاکۆسی بەخۆیە بینیوە، بەلاّم لە بەرگی جیاوازتردا لەڕوی شوێن و کات و بیروباوەڕ و بەهای کۆمەلاّیەتیدا،، شۆڕشی یەکەمی

زنجیــەکان یــەکێك بــووە لەوانــەو گرنگترینیــان بــووە، دوای ئــەوە شۆڕشــی قەرامیتەکان، کە هەندێك لە مێژوونوسان بە شۆڕشێکی کۆمۆنیزمانەی ناو ئەبەن، لە مێژووی ئیسلامیشدا شۆڕشی لەو دوو جـۆرە هــەبوون کــە دوور یانزیك لە یەکچوون یا جیاوازبوون لە ڕووی بیرکردنەوە و چۆنیەتی بەرپابوون و شێوازی تێکۆشــانیانەوە، گــرنگترین و بــەتامترین باســی مێــژوویی لــەو بارەیــەوە کــە خوێندبێتمــەوە دەربــارەی ئــەو شۆڕشــانە و هەڵگیرســان و کوژاندنەوەیان کتێبێکی بندلی جوزی بــوو بــەناوی (الحرکــات الفکریــە فــی الاسلام) ئەوەشــی ئاشــکراو دیــارە هــەموویان بــە ڕوخــان و ســەرنەکەوتن کۆتاییان هاتوە .

هەریەکیك لەو شورشانەش هۆکاری تایبەتی خــۆی هــەبوە بــۆ ڕوخــان و سەرنەکەوتنی، بەڵام هۆکاری هاوبەش هەبووە لە نێوانیاندا بۆ سەرنەکەوتن، جگــە لــەوەی کــە زۆریــان لــە ئامــانج و شــێوازەکانی ئیشــکردن و جەماوەرەکەیان و چۆنیەتی سەرکردایەتیکردنی ئەوشورشانە هاوشێوە و بــێ جیاوازی بوون، هۆکاری هاوبەشی سەرنەکەوتنیشیان ئەوەبوە کە ئــەوان لــە مەرجە مێژووییەکان سوودیان وەرنەگرتوە و هیچ دەرسێکیان وەرنەگرتوە لە شورشەکانی پێش خۆیان،بەتایبەتی سوودیان لــە شورشــەکەی ســپارتاکۆس وەرنــەگرتوە، کــە گــرنگترین مەرجــە بــۆ دەســتەبەرکردنی ســەرکەوتن و بەدەستهێنانی ئامانجەکان،هۆکاری تری هاوبەشیش کە بۆتە هــۆی ڕوخــان و سەرنەکەوتن لە ڕوداوە مێژووییەکاندا ئەوەیە کــە ســەردەمی هەڵگیرســانی ئەو شورشانە لە ڕووی کامڵبوونەوە  ئامادەباشی بابەتیانەی تیــا نــەبووە و پێنەگەشتووە، تا بتوانێت ئامانجەکانی یا هەندێك لە ئامانجەکانی بەدەســت بهێنێ.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە سەرنەکەوتنی هەموو ئەو شۆڕشانە، بە شورشی فەرەنسیشەوە، بۆ بەدەستهێنانی ئەو دروشمانەی کە بەرزیانکردبۆوە، کە کۆمەڵە دروشمێك بوون تەعبیریان لە ئاوات و خواستەکانی مرۆڤ ئەکرد بۆ ڕزگاربوون لە زوڵم و زۆر و بەدیهێنانی یەکسانی کۆمەڵایەتی، نابێت ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە بەدرێژایی مێژوو ئەو شۆڕشانە ئاستبەرزییان پێوە دیاربوە لە شورشێکەوە بۆ شۆڕشێکی تر بە گوێرەی چۆنیەتی بیروباوەڕ و شێواز و ئامانجەکان،ئەو ئاستبەرزیەش بێگومان لەوەوە سەر هەڵئەدات کە ئەنجامەکانی هەڵگیرسانی ئەو شورشانە یەك لە دوای یەك لە چۆنیەتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و پێشکەوتنی شارستانیەت بە پێی لێکدانەوەی زانستیانەو مێژووییانە بۆ مانای ئاستبەرزی و پێشکەوتن دیاری کردوە،هەربەو پێیەش شۆڕشی فەرەنسی بە دڵنیاییەوە شۆڕشێکی ئاستبەرز بووە، ئەو دروشمانەی کە وێنایان کێشابوو دەربارەی برایەتی و سەربەخۆیی و یەکسانی، و شەرعیەتی مافەکانی مرۆڤ و جیاکاری لە نێوان ئاین و دەوڵەت کە دواتر وەك سیمایەکی دەوڵەتی مەدەنی و عیلمانی لە ئەوروپای نوێدا ناسرا،ئەمانە هەمووی ئاماژەی ئاستبەرزی ئەو شۆڕشەی فەرەنسا بوون، سەرباری ئەوانەش دەربازبوونێکی بێ وێنە بوون لە سەردەمی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی لە ئەوروپادا، ئەمەش ڕێخۆشکەریك بوو شانبەشانی شۆڕشی ئنگلیزی کە یەك سەدە لە پێشیەوە بوو، هەروەها شورشی ئەمریکا کە دوای ئەم بوو بۆ گەیشتن بە ڕژێمێکی سەرمایەداریی نوێ، کە بوە شا ناونیشانی ئەوروپای نوێ لە سەدەی نۆزدەهەمدا، کە ئەمەش باشترین بەڵگەی پیشکەوتن بوو لە ناوەندە جیاوازەکاندا ، کە پەیوەست بوو بە چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە، لەگەل زولم و زۆری کۆمەڵایەتی و

چەوسانەوەی نەتەوایەتی و دابەشبوونێکی نادروستی بێ وینەی سامان بە شێوەیەکی جیاوازتر لە پێش خۆی، بەڵام شورشی فەرەنسی لە ڕازاندنەوەی درووشم و بیروباوەڕەکاندا بانگەشەیان بۆ سەردەمێکی ڕوناکبیریی و لە دایکبوونی بیروباوەڕێکی نۆیّ ئەکرد و بە سەردەمی ڕاپەرینیان لە قەڵەمدا، لە ڕاستیشدا وابوو، کە هەموو ئەوروپای ڕزگارکرد لە سەردەمی دادگاکانی پشکنین و جووڵاندنەوەیەکی گەورەی لە پێشکەوتنی مرۆڤدا دروستکرد لە ڕوی فیکری وسیاسی و فەلسەفی و زانست و ئەدەب و هونەردا، ئەمەش سیمای ڕاپەرینێکی نوێی پێبەخشی ، بەڵام ئەوەی پێویستە بە گرنگ وەربگیرێت سەبارەت بە ئێمە لە خویندنەوەماندا بۆجووڵانەوەی ڕەوڕەوەی مێژوو بە لای پێشکەوتنخوازیدا، ئەوەیە کە شۆڕشی فەرەنسی ڕێچکەیەکی بۆ فکری سۆشیالستی نویّ کردەوە، خەسڵەتی (سۆشیالستی زانستی) ناساند بەرانبەر(سۆشیالستی تۆباوی)کۆن، پرۆژەکەی مارکسیش لێروانینێکی ورد بوو گرنگیەکی گەورەی هەبوو لە ڕوی مێژووییەوە، چونکە پرۆژەکە لە کاتی خۆیدا بریتی بوو لە گۆڕینی جیهان بەو ئاڕاستەیەدا کە خەوی پێوە ئەبینی، کە ئەویش ڕیگە برینێك بوو پێش جووڵانەوەی مێژوو بەرەو ئەو ئاقارەی کە مارکس و ئەزموونی سۆشیالستی مەبەستێتی بۆ بەدەستهێنانی ئەو خەونە مەزنەی کە مرۆڤ بەرەو یەکسانی کۆمەلایەتی و پێشکەوتن ئەبات (لیرەدا نوسەر مەبەستی ئەوەیە گەشتن بە پلەی سەرمایەداریی هەنگاویك مەسەلەی سۆشیالستی نزیك ئەکاتەوە بەوەی ڕەوڕەوەی مێژوو یەکێك لە قۆناغەکانی تەواو کرد و پێشوەختی خۆی گەشتە قۆناغی سەرمایەداریی – وەرگێڕ) مارکس لە دارشتنی پرۆژەکەیدا پشتی بەستبوو بەوەی کە پێشکەوتنێکی ئابووری گەورە لە سەر دەستی بۆرژوازیەتی ئەورویی بالادەستدا دێتە ئاراوە، هەروها دەرکەوتەی زانستی

لـه بوارەکانـدا سـەر هەڵئـەدات، ئـەم خوێندنەوەیەشـی گەیاندبویـە ئـەو قەناعەتـەی کـە ڕژێمێکـی سـەرمایەداری دێتـە ئـاراوە کـە بریتیـە لـە ژێردەستخستنی مرۆڤ لـە لایـەن مرۆڤـەوە، کـە ناسـراوە بـە بـە سسـتمی زێدەبایی (فائض القيمة) بەمەش مارکس بۆچونەکانی بـەدیهات لـە پـرۆژە نوێکەیدا کە گۆڕانێکی گەورەی پێشتر نەبینراو لە جوولآنەوەی مێژوودا ڕوو ئەدات کە مرۆڤ لە سەردەمانێکی زووەوە هەوڵی بۆ ئەدات، بەلآم بە چـەند مەرجێکی جیاواز لە پێناو سەربەستی و یەکسانی کۆمەلآیەتیـدا و لەسـەر بناغەی بۆچونەکانی مارکس، مارکسـیش و ئنگلسـی هاورێشـی شۆڕشـی فەرەنسـیان بەکـەم وەرنەگرتبوو،لـە بەرهەمـەکانی دواتـری ئەوشۆڕشـەش کۆمۆنەی پاریس بوو،

مارکس ڕەخنەی لە سەرکردایەتی کۆمۆنەی پاریس گرت، ڕەخنـەی لـەو سەرکێشـیە گـرت کـە ئـەوان بانگەشـەی شۆڕشـیانکرد پـێش پێگەشـتنی مەرجەکانی، هەروەها پەنجەی بۆ کەموکوریەکانی ڕاکێشا، بـەلآم بـەرێزەوە ستایشی ئازایەتی پاڵەوانەکانی کرد، مارکس پێی لەسەر ئەوە داگـرت کـە کۆمۆنە مەرجەکانی سەرکەوتنی نەخشە نەکێشابوو، بەڵکوو وەك پرۆڤەیەك وابـوو بـۆ شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر کـە دوای پێـنج وەرز لـەدوای کۆمۆنـەوە هەڵگیرسا، ئەوەبوو شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە سـەرکردایەتی لیـنین بـوو بـەناوی سۆشیالستی مارکسەوە و هەمو درووشم و پرۆگرامە سیاسیەکانیش هەر بە ناوی ئەوەوە دەرچوو،

بەلآم ئەوانەی کە بیروبـاوەڕی شوڕشـی ئۆکتۆبـەریان قۆسـتەوە و پـرۆژە پەیوەندیدارەکانیان گرتەدەست، دوای دامەزرانـدنی یـەکێتی سـوڤێت وەك یەکەم دەوڵەتی سۆشیالسـتی لـە مێـژوودا، نـەیانتوانی ئامانجـەکانی ئـەو شۆڕشە جێبەجێ بکەن و درووشمەکانی بـەدیبهێنن، تەنانـەت نەشـیانتوانی

مرۆڤانــه ڕێــز لــه بــەهای سۆشیالســتی بگــرن وەك ئــەوەی کــە مــارکس دایڕشتبوو، لەبەر ئەوە ئەو پرۆژەیە و ئەو ئەزموونە ڕووخـا، هــەروەك چـۆن شورِشەکانی تری پێش خۆی سەرنەکەوتبوون، یەکێك لە توخمـە خراپــەکانی ئەزموونی سۆشیالستی کە بوە هــۆی ئــەوەی دوای سێچارەکە ســەدە ئــەو ئەزموونــە بڕوخێــت، ئــەوەبوو کــە زووربــەی بەرپرســە بنەڕەتیــەکانی جێبەجێکردنی بیروباوەڕەکان لــە مومارەســەکردنیدا لایانـدا، بــە تایبــەتی هەوڵدانیان بۆ بازدان بەسەر مەرجە بابەتیەکانی جووڵانەوەی مێـژوودا، بـێ ئەوەی ئەوە ڕەچاو بکەن کە ئەگەر بە پێی مەرجە بابەتیــەکان نەجولێنــەوە مەحاڵە بتوانن سەربکەون و ئاسوودەیی و سەربەسـتی بەدەسـت بهێنن،کــە سۆشیالســتی پــەیمانی هــەردووکیانی بــە مــرۆڤ دابــوو، بۆیــە ڕوخــان و سەرنەکەوتن چاوەڕوانیان بوو، تەنانــەت ئەگــەر دوریــش بکێشــێ بــۆ ســێ لەسەر چواری سەدەیەك، وێڕای ئەوەش ئەو سەرکردانەی دوای مردنی لیــنین دەسەڵاتیان وەرگرت و پرۆگرامێکیان دانا بەناوی (سیاسەتی نوێی ئــابووری (NEP- نیپ) تووشی هەڵەی زۆر گەورە بوون بەتایبەتی لە ڕووی پرۆسەی سیاسیەوە، تا گەیشتە ئەوەی کە زۆر تاوانی گەورە ئەنجام بدەن بە تایبــەتی لــە ســەردەمی ســتالیندا، کــە زۆر لەوانــەش کــە تاوانیــان بەرانبــەر کــرا هاوڕێیانی لینین بــوون لــە ســەرکردایەتی شۆڕشــی ئۆکتۆبــەردا، جگــە لــە ملێۆنەها کەس لــە خــەڵکی ســۆڤێت لــە جوتیــار و کرێکــار و ڕۆشــنبیر و هونەرمەندو کەسانی داهێنەریش لە بوارەکانی بیروباوەڕو زانستدا .

ئەم تاوانانە کاریگەریی کەم نــەبوو لەســەر ئەزموونەکــە، هــەموو ئــەو کارانەی ستالین پێی هەستا وەك خێــرا بەرەوپێشــبردنی ئــابووری ســوڤێت و دروستکردنی جبەخانەیەکی گەورەی سەربازی پڕچــەك بــۆ بــەرگریکردن لــە دەســەڵاتی ســوڤێت وســەرکەوتنەکانی لەشــکر و گــەل بەســەر لەشــکری

داگیرکەری هێتلەردا بە سەرکردایەتی ستالین خۆی،هیچی ئەو هەڵانەی ستالینی نەسڕیەوە، هەڵەکانی لە ناو ئەزموونەکەدا بە شێوازی جیاجیا بەردەوام بوو لە هەموو بوارەکاندا وەك ئابووری و ڕۆشنبیری و فکری و سیاسی وکۆمەڵایەتی،و هەموو ئەوانەی پەیوەست بوون بە سەربەستی خەڵکان و مافەکانیانەوە، ئەم هەڵانەی ستالین لە ناو ئەزموونەکەدا بەردەوام بوو لە دوای مردنی ستالینیشەوە، خەڵکان سەربەستیان نەبوو ئەچەوسێنرانەوە و مافی ڕادەربڕینیان لێ سەندرابوەوە، تەنانەت ڕیگەی ڕادەربڕین لەوانەش گیرابوو کە ئەیانویست بیروڕای خۆیان بۆ چاککردنی باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی پێشکەش بکەن ، ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ نەئەگیرا، ئەمانە هەمووی کاریگەری خراپی هەبوو بۆ پرۆژە گەورەکەی مارکس کە گۆڕینی جیهانە، بێگومان ئەم هەڵانەش مارکس لێی بەرپرسیار نییە، بەم جۆرە سەرکردەکانی ئەزموونی سۆشیالستی لە سەردەمی خۆیاندا هەمان هەڵەیان دووپات کردەوە کە ئەوانەی پێش خۆیان کردبویان، بێگومان شورشی سپارتاکۆس بۆیە هەڵگیرسا چونکە سەردەمێکی مێژوویی لە پێشتر هاتبوە ئاراوە کە پێویست بوو بگۆڕێت بۆ ئەم شێوازە باشترە، بەهەمان شێواز هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەریش هەر پێوێستیەکی مێژوویی بوو بۆ ئەو سەردەمە، کە بە شێوازێکی ترو بە فکرێکی پێشکەوتو ترو ئامرازێکی باشترەوە هاتبوە کایەوە، کە بیرباوەڕی مارکس بوو بۆ ڕزگارکرنی مرۆڤ لە زوڵم و زۆر و چەوساندنەوە، بۆیە شۆڕشی ئۆکتۆبەر شۆڕشیکی ئاستبەرز بوو چ لە ڕوی ئامانج و چ لە ڕوی بیروباوەڕەوە،وێڕای ئەو هەموو هەڵە و کەموکورتیەوە لە پیڕەوکردنی بیروباوەڕی سیاسیدا، کە لە ئەنجامی ئەو هەڵانەوە دوای سێ لەسەر چواری سەدەیەك هەرەسی هێنا ،کەواتە هەرسەردەمەو زەرورەتی

کاتی خۆی هەیە و ئەو پێشکەوتنە مێژووییە ئامادەکاری ئـەکات بـۆ دوای خۆی،لەبـەر ئـەوە ئەگـەر سـەرکردەکانی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر پلانێکـی دیاریکراویـان هـەبووبێ بـۆ ئـەو سـەردەمە و سـەرکردەکانی بزوتنـەوەی سۆشیالستی بیانەوێ لە هەمان قالبدا کار بکەن واتە هەمان هەڵەی ئەوان دووبارە ئەکەنەوە، وێڕای ئەوەش هەڵەی ئەمان گەورەتر ئەبێت، چوونکە لـە سەردەمێکی مێژوویی پێشکەوتوتردا ئەو هەڵەیەیان کردوە، هەڵەیـەکیان دووپاتکردوتەوە کە سێ لەسەر چواری سەدەیەکی بەسەرا ڕۆشتووە.

لەگەڵ یادخستنەوەی ئەو مێژووە و ئەو شوڕشانەی تیا بەرپا بوون لە ژێر دروشمی سەربەستی و ڕزگاربوون لە زوڵـم و زۆر، لـە پێنـاوی پێشـکەوتندا بەهەموو شێوازەکانیەوە، دواتریش سەرنەکەوتن و ڕووخانی ئەو شۆڕشـانە و لەپاش بەجێمانی کاولکاری و نەهامەتی لە ئەنجامی ئەو سـەرنەکەوتنانەدا، نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت کە باسی ڕۆڵی ئـاین بکـەین لـە بـواری ئـەو جووڵانەوە مێژووییەدا، لەسەردەمانی کۆنـەوە چ یەکتاپەرسـتی و ئەوانـەی دژی بوون وئەوانەی لە پێش ئەوانیشەوە بوون، هەر بانگەشـەی بیروبـاوەڕی بەنرخی مرۆڤ و چاکە ویستن بۆ مرۆڤیان کردوە، خێریان ویستوە نەك شەڕ و مژدەی بەهای بەرزی مرۆڤایەتیان مەبەست بـووە، ئەمـە خـۆی لـە خۆیـدا بەشێك بووە لەسەرەتای ئەو شۆڕشانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی ناسیویەتی، مارکس نازناوی شۆڕشی ناوە لە ئاینی مەسیحی و ئـاینی ئیسـلامیش لـە سەرەتای دروستبوونیاندا ، بەڵام ئەم شۆڕشانە هەر زوو دژی ئەو بانگەشەیە گۆڕا بە پێچەوانەی ئەوەی کـە لـە پێناویـدا دروسـت بوبـوون، هەرلەسـەر دەستی ئەوانەشا کە پێی هەسـتابوون، هـەر ئـەو نەهامەتیانـەش لـەدوای دروستبوونی ئەوانیشـەوە هـەر بەردەوامـە تـا ئـەمڕۆ، تەنانـەت زۆر لـەو درووشمانەی کە ئیسلامیش هەڵی کردووە،وەك ئەوەی لێهاتووە کە درووشمـی

دژە پێشــــکەوتن و کۆنەپەرســـتی و دژایـــەتی پێشــــکەوتن و دژایـــەتی خۆشگوزەرانی مرۆڤ بێت، هەندێکیش لەو جوولاّنەوە ئیسلامیە توندڕەوانــە بوونەتــە جوولاّنــەوەی ئیرهــابی بــە هــەموو شــێوازە ناشــیرینەکانیەوە، هەندێکیش لەو جوولاّنەوە مەزهەبیانە بە ناوی چاکسازی ئاین و چاکســازی کۆمەلاّیەتی و ڕزگارکردنی ئـاینی ئیسـلام لـەو حالّەتـەی کـە تیایـەتی،بۆ ئەوەش کەوتوونەتە خۆیـان وهـەوڵی ئـەوە ئـەدەن کـە نـەهێڵن چـیتر دژی پێشکەوتن و ئاسودەیی و سەربەستی مرۆڤ بەکار بێت.

لە ڕاستیدا لە هەموو ئەم بیرخستنەوە مێژووییانەدا دەربارەی شـوڕش و بیروباوەڕی هەوڵدان بۆ سەربەستی و پێشکەوتن،مەبەسـتم ئەوەیـە تەئکیـد لەوە بکەمەوە کە مرۆڤ بە بەردەوامی تێکۆشاوە و تێئەکۆشێت  لە پێنـاوی ژیانێکی باشتردا، نەوەستاوە و ناشوەستیّ، بەڵکو لە هەوڵیشایە بـۆ گرتنـە بەری ڕیّ وشوێنی تازەتر و گونجاوتر لە پێنـاوی پاشـەڕۆژدا، هەرچـەندە لـە سەردەمانی پێشودا مرۆڤ بە نەهامەتی و بەسـەربردنی ژیـانێکی قوورسـدا ڕۆشتوە، بەهۆی ئەو هەرەس و تێکشکانانەی کە تووشی بووە بـە تایبـەتی لە چارەکی کۆتـایی سـەدەی بیسـتەمدا، کـەوەك بومەلەرزەیـەکی گـەورە هەموو جیهانی هەژاندوە، حاڵەتی مرۆڤیشی بەرەو ئاستێکی قورستر بـردوە و پێشبینی ئەوەش ئەکرێت ڕەوڕەوەی مێـژوو بـەرەو سـەردەمێکی قورسـتر بچێت .

مەبەستی سەرەکی بیرخستنەوەی ئەم ڕوداوە مێژووییانەش بەلای منەوە بانگەشەیەکە بۆ دەرس وەرگرتن لەو مێژووە ڕابردووە لە پێناوی پاشەرۆژدا، گرنگترینی ئەو دەرسانەش زانینی ئەو کەم و کورتیانەیـە کـە بوونـە هـۆی هەرەسی ئەو شۆڕشە گەورانە،لەبەر ڕۆشنایی ئەو وانانـەدا هەوڵبـدرێت کـە پێشڕەوایەتی ئەو شۆڕشانە بە شـێوەیەکی دروسـت و بـیّ هەڵـە بێـت تـا

بتـوانرێ مـرۆڤ لـه سـتەم و ژێردەسـتەیی ڕزگـار بکرێـت وسەربەسـتی و پێشکەوتن بۆ سـەرجەمی مـرۆڤ بەدەسـت بێـت و کـۆت و پێوەنـدی نـوێ بشـکێنرێت و بـه گـوێرەی مەرجـه نوێکـانی سـەردەم بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجەکان هـەنگاو بنرێـت، بێگومـان ئـەو مەرجانـەش زۆر جیـاوازه لـه مەرجەکانی سەردەمەکانی ڕابردوو، تەنانـەت جیاوازیشـه لـه چـواریەکەی کۆتایی سەدەی ڕابردووش، له هەمان کاتیشدا پێویسته لەسـەرمان گرنگـی بـەوه بـدەین کـه مەرجـەکانی تێکۆشـانی نوێمـان بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجەکانمان مسۆگەره و دڵنیایی تیایه، هەروەها گرنگیشه ئـەو بـڕه زۆره دەسکەوتەی زانست که هەمووی ئاماژەیه بـۆ پێشـکەوتنی سـەردەم و لـه خزمەتی مرۆڤدایه چۆن ژێردەستی ئەخەین و سودی لێ وەرئەگرین،هەروەها هاوبەش بین لەگەڵ چەپەکانی هـەموو دنیـادا بـۆ خزمـەتی مرۆڤایـەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ له ژێردەسـتەیی و چەوسـاندنەوه کـه سـەرمایەداریی لـه هەموو نەهامەتیه بەردەوام و یەك له دوای یەکەکانیدا ئەیکاتـه سەربەشـی مرۆڤ، له لایەکی تریش ئەوەی ئەو ئەرکەمان گـران ئـەکات ڕەگەزپەرسـتی وگێرەشێوینی و بێ بەهایی هەندێکه و، توندڕەوی و تاوانبـاریی هەندێکـه، دژ به گەلەکانیان و سـەرجەمی مـروڤ، لەبـەر ئـەوه لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ڕوداوانه و ئەو گرفتانـەدا کـه پەیوەسـتن بـه مەسـەلەکەوه ئێمـه گرنگـی ئەدەین بەوەی که لەڕوداوی ڕابردوو دوورکەوینەوه و له پێناوی ڕزگـارکردنی مرۆڤدا لەگەڵ ڕەوڕەوەی مێژوودا ڕێڕەوی جیـاواز بگرینەبـەر، تـا ئەگەینـه بەدەستهێنانی خەونەکانی مرۆڤ بۆ سەربەستی و یەکسـانی و دادپـەروەری، ئەویش به دامەزراندنی ڕژێمێکی مرۆڤانەی جیهانی باشتر و دادپەروەرانـەتر له هەموو ئەوانەی پێشو .

تەنها ئێمەی چەپە کۆنەکان و نوێکانی ئـەم ولاّتانـەی خۆمـان نـین کـە گرنگی بەوە ئەدەین کە تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی ئـەو ئامانجانـە ئەکـەین و هەوڵی بۆ ئەدەین و دواتریش سەرکەوتوو نابێـت، وتـەنها ئێمـەش نـین کـە ئەگەڕێین بۆ هۆکارەکانی هەرەسهێنانی ئەو شۆڕشـانە لـە مێـژووی کـۆن و نوێدا، بە ڵکوو ئەوە جێگەی گرنگیپێـدانی هـەموو چـەپەکانی دنیایـە بـە هـەموو جیاوازییەکیانەوە،هـەروەها جێگـەی گرنگیپێـدانی هـەموو ئـەو تێکۆشـەرانەیە کـە لـە پێنـاوی ئـازادی و پێشـکەوتن و دادپـەروەری کۆمەلاّیەتیدا ئەجەنگێن لە هەموو جیهاندا .

بەلاّم ئێمەی چەپ بە کۆن و نوێوە گرنگە لامان کـە ئەوپـەڕی تواناکـان بخەینە گەڕ لەبەر ڕۆشنایی مەرجـە نوێکـانی سـەردەمدا کـە دەسنیشـانی ئەرکی ڕزگارکردنی وولاّتەکانمان بخەینە ئەستۆ لە دواکەوتوویی وبەردەوامبین لـە پرۆسـەی ڕزگـارکردنی گەلـەکانمان لـە ڕژێمـە سـەرکوتکەرەکانی، کـە ماوەیـەکی دوروو درێـژە بـە ئاسـتی جیـاواز و شـێوازی جیـاواز ئەیانچەوسـێننەوە، هـەوڵی بەدەسـتهێنانی پێشـکەوتنی ئـابووری و کۆمەلاّیەتی بدەین بە هەموو شێوەیەك، کە ئەمانە دوو ئامانجی سەرەکین و پەیوەستن بە بیروباوەڕ و بەهای سۆشیالستیەوە، گرنگی ئەدەین بـەوەی کـە بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ بکەین وبیکەینە کێشەی خۆمان و لەم ڕووەوە بـە کارێکی سەرەکی دابنێن و داینـێن بـەوەی کـە ئەمـە یەکێکـە لـە بنـەما سەرەکیەکانی دامەزراندی دەوڵەتی نویێ کە وولاّتەکانمان پێویستی پێیەتی.

ئەم تێکۆشانە نوێیەی ئێمە بە پێـی ئـەم مەرجانـەی ئـەم سـەردەمە و بەپێی ئەو دەرسانەی لە مێژووی کۆن و نوێوە وەرگـیراوە شـێوازێکی ورد و نوێمان بەسەرا ئەسەپێنی کە واقیعبینانـە سەربەسـتیەکانی مـرۆڤ ومـافی ژیـانی بـەمافێکی بنـەڕەتی بـزانین و نەکەوینـە هەڵـەی ڕەگەزپەرسـتی و

هەرکەس بە ئارەزووی خۆی و بە ڕێگەی خۆی پێڕەوی بکات،وەك ئەزموونە کۆنەکان و نوێکانیش پیشانیان داین و مافەکانی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ بەکەم سەیر نەکەین .

ئەوەشی کە مەبەستم بوو لەم پێشەکیەدا هاندەرێك بم بۆ گەڕان و بیرکردنەوە و بەرەوپیر چوونی ئەو تێکۆشانەی کە گەلەکانمان دەستیان پێکردوە و تەواوکەری بین،

ئەمە ئەو کتێبەیە و ئەوەش ئەرکە هەنوکەییەکانە کە پەیوەستە بەو پاشەرۆژەوە کە گرنگی پێئەدەم .

کەریم مروە

# دەرگای یەکەم

# چەپ و گۆڕانکاریەکانی سەردەم
# بەرەو ڕژێمێکی جیهانی نوێ

## چوونە ناوەوەیەکی پڕ کێشە بۆ گۆڕانکاریەکانی سەردەم:

دنیای سەردەم گۆڕانکاری گەورە بە خۆیەوە ئەبینێ لە گەلێك ڕوانگەی جیا لەیەك و دژ بەیەكدا، ئەو گۆڕانکاریانە هەڵگری خەسڵەتەكانی سەردەمەکەن کە دوای ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستی دروستبوون، وهەر دوای ئەویش گۆڕانکاریەکان گەشتنە ئەنجام، کە سەرەتاکەی ئەگەڕێتەوە بۆ وەرزی کۆتایی سەدەی ڕابردوو، و تا سەرەتای ئەم سەدەیەی ئێستاش، ئەم گۆڕانکاریانەش خەسلەتی ڕاستەقینەی سەردەمەکەی دیاری کرد بە هەمو ناکۆکیەكانیەوە،لەبەرانبەر ئەوەشدا ئەتوانین بلێین حەقیقەتێکی ڕیژەیی بوو، واتە ڕەها نەبوو، هەروەها ئەو ناکۆکیانەش کە پەیوەست بوون پێوەی فرە جۆر بوون، ئەوەی کە مەبەستی منە ئەو گۆڕانکاریە مێژوویيانەیە کە هەڵگری خەسلەتە مێژووییەکانی سەردەمەکە بوو و تەعبیریان لە ڕێڕەوی جووڵانەوەی مێژوو کرد، لە بەرەو پێشچوون و پاشەکشەکردن بە شێوەیەکی نا جێگیر کە ناتوانرێ سنوردار بکرێت و سەقامگیر ببێت، ئەگەر چەپ بیەوێ لە جیهانی عەرەبیدا شوێنی خۆی ببینێتەوە و ڕۆڵی خۆی ببینێ لە سێبەری ئەو گۆڕانکاریانەدا، دوای ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستی، پێویستە ئەو ڕاستیانە بخوێنێتەوە، ڕاستیە مێژووییەکانی کۆن و نوێ،

خوێندنەوەیەکی قووڵ و بابەتیانە، بە جیا لە بیرکردنەوەی ڕابردوو و بەدەر لە سێبەری ئەو ئایدولۆژیایەی کە پێشتر لە ناو بزوتنەوەی سۆشیالستیدا باو بووە بە هەموو باڵەکانیەوە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە مەرجدارە، و کەسی تایبەتمەندی خۆی ئەوێت لە هەموو گۆڕەپانە جیاوازەکاندا، شارەزا لە زانستی مێژوو و زانستی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونناسی و زانستی سروشت ، تەنانەت ئەو زانستەشی کە پەیوەندی بە زانیاری جیناتەوە هەیە،لە پێشەکی ئەو مەرجانەدا کە ئاماژەم پێکرد، پیاچوونەوەیەکی بابەتیانە بۆ ئەزموونی سۆشیالستی کە داڕووخا، هەروەها دیاریکردنی ئەوەی کە ئەتوانرێ دیاریبکرێت لە هۆکارەکانی، بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە هۆشیاری مرۆڤەوە هەیە ، لەگەڵ بینینی لایەنە ڕوناك و ڕاستەکانی بەبێ گەورەکردنی، هەروەها بینینەوەی نادروستیەکان بەبێ رك و کینە، ئەمجۆرە پیاچونەوەیە من لە کتێبەکەمدا (هەڵەکان لە کوێدا بوون لە ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستیدا) پێڕەوم کردووە ،جگە لە زۆر نوسینی تریشدا .

بەڵام من هەرچەندە هەوڵمدابێت خۆم بەو خاوەن تایبەتمەندییە نازانم کە پێشتر ئاماژەم پێکرد لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستیدا بۆ گەڕان بەدوای بنەڕەتە مێژووییەکەی گۆڕانکاریەکانی سەردەمدا، تەنها لێرەشدا و لە کتێبەکانی تریشمدا پیاچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەم کردووە ، لە ڕوانگەی ڕوانینمەوە بۆ داهاتوو دەربارەی پێگەی چەپ و ڕۆڵی چەپ تیایدا، بە هیچ جۆرێك خۆم نەئاخنیوەتە لێکۆلینەوەیەکی وەهاوە کە باس لە ڕەگە مێژووییەکانی ئەو گۆڕانکاریانە بکات، بەڵام بە پێی ئەزموونی سیاسی و فکری دوور ودرێژی خۆم و وەك چەپێکی مارکسی و لە بەر ڕۆشنایی ئەو ئەزموونەدا بیروڕاکانی خۆمم بنیاتناوە دەربارەی ئەو پیاچوونەوە ڕەخنەییە، هەروەها بە پێی توانا و ئاگاداریم لەو لێکۆلینەوە هەمەچەشنانەی لەو

بوارەدا کراون لــە ڕوانگــەی جیاجیــاوە دەربــارەی ئــەو گۆڕانکاریانــە، لەبــەر ڕۆشناییی هەموو ئەمانەدا ئــەتوانم بڵــێم چــەپ لــە جیهــانی عەرەبیــدا، بــە تایبەتی چەپی نوێ،پێویستە دەست بکات بە گــەڕان بــە شــوێن پاشــەڕۆژدا، نەك تەنها تا ئەگاتە ئەزمونی سۆشیالستی، بەڵکوو بە قووڵی خــۆی خــەریك بکات بە خوێندنەوەی ئەو گۆڕانکاریە گەورانەوە کە لە جیهانــدا ڕووئــەدەن، نەك هەر ئێستاو لە یەك لایەنــەوە بــەڵکوو بــە شــێوەیەکی فــرە ڕوانگــە تــا گەیشتن بە ڕەگە مێژووییەکانی قۆنــاغ دوای قۆنــاغ، هــەروەها لەســەر چــەپ پێویستە کە واقیعبینانە هەست بەوە بکات کە دونیای ئــەمڕۆ کــە دونیــای عەرەبیش بەشێکن لەو و پابەندن بەو گۆڕانکاریانەوە کــە بەنــدە بــە ڕژێمــی سەرمایەداری گلۆباڵەوە بە هەموو ناکۆکیەکانیەوە چ بــاش و چ خــراپ، ئــەم دوو لایەنــەش، باشــیەکانی کــە بریتیــە لــە پێشــکەوتن لــە زۆر بــواردا خراپیەکەشــی کــە لــەو وەحشــیەتەدا خــۆی ئەبینێتــەوە کــە سیاســەتی سەرمایەداری گلۆباڵ پێڕەوی ئەکات بەرانبەر مرۆڤایەتی، لە لایەکی تریشەوە مارکسیش ئاماژەی بەمە کردووە کە ناتەباییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوو حاڵەتەدا، لە لایەك پێشکەوتنی بــواری زانســتی و پیشەســازی، لــە لایــەکی تریش شپرزەیی هۆشــیاری مــرۆڤ ،ئەمــەش لــە ووتەیەکیــدا لــە لەنــدەن لــە یۆبیلی(ڕۆژنامەی گەل دا _ جریده الشــعب – the peoples paper) لــە ١٤ نیسانی ١٨٥٦ دا کە ئەڵێ :

(....... لەوە ئەچێت لەم سەردەمەی ئێمەدا هــەموو شــتێك پێچــەوانەی خــۆی بێــت، ئــەو ئامێرانــەی کــە توانایــەکی سەرســوڕهێنەریان هەیــە لــە بەرهەمهێناندا کەچی برسێتی و نەهامەتی بــۆ مــرۆڤ ئەهێنن،ئــەو سەرچــاوە گەورەیەی داهات وەك جــادوو بــەبێ ئــەوەی بزانــرێ بــۆ ئەبێتــە سەرچــاوەی هەژاری، هەروەها ئەو سەرکەوتنە تەکنۆلۆژییە گەورەیە لەگەڵ خۆیا دارِمــانی

ڕەوشت ئەهێنیٚ، وەك ئەوە دێتە پێش چاو کە وەك ڕابردوو مرۆڤ کۆیلـە بێـت ، کۆیلەی ئامێر و ئەوەندەی کە ئەبێتە ژێر دەستەی ئـامێر ئەوەنـدە خـاوەنی خۆی نییە، تەنانەت ئەو ڕووناکیەی کە داکـەوتووە لەگـەڵ خۆیـا جەهالـەتی هێناوە  و بەشە ڕووناکیەکەی بۆ مرۆڤ نییە و هـەر دیـوە تاریکەکـەی زاڵـە، وەك ئەوەی ئەو هەموو داهێنان و پێشکەوتنە ئـەم واقیعـە تاڵـەی درووسـت کردبیٚ کە هێزی ماتەر هێزی فکری بجولێنیٚ، و ئـەویش بگۆڕێـت تـەنها بـۆ هێزێکـی ماتـەری و مـرۆڤ یەخسـیری ماتـەر بکات،ئەمەیـە لـێکترازان و لێکدورکەوتنەوەی پیشەسازی سەردەم و زانستی سەردەم،ئەمەیە لـێکترازان و لێکـدابڕانی هەڵکشـان بـەرەوژوور و داڕمـان، هـەروەها لێکـدوری هێـزی بەرهەمهێنان و پەیوەندیە کۆمەلاٚیەتییەکان کە لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا بـە ڕونی هەستی پیٚ ئەکرێت و جێگەی مشتومڕ نییە، هەندێك حزبیش ئەیـەوی پیلانی دژ بکات و هەندێکیش ئەیەوێت لەو تەکنیکە تازەیە ڕزگاری ببێت تا لەو دوورکەوتنەوە تازانە  بە دوور بێت، هەندێکی سێهەمیش لای وایـە  کـە هەر ئەبێت ئەو پێشـکەوتنە گەورەیـەی پیشەسـازی خـۆی تـەواوو بکـات و بەقەدەر ئەوە لەبەردەمیا سیاسەت تیایا پاشەکشـە بکـات، بـەلاٚم ئێمـە لای خۆمانەوە ڕوانینی سروشتی خۆمان لەدەست نادەین،  هـەروەك بیرکردنـەوەی هەردەمی خۆمـان دەربـارەی ناکۆکیـەکان، ئـەویش ئەوەیـە کـە ئـەو هێـزە کۆمەلاٚیەتییە نوێیە هیچی ناوێت یەك شت نەبێت، ئەویش ئەوەیـە کـە ئـەو توانا تازانە ئەبیٚ خەڵکانی تازە بیگرنە دەست و هەڵیسورێنن، کـە ئەوانـەش کرێکارانن، کرێکارانیش وەك ئەو ئامێرانە داهینراوی ئەم سەردەمەن)

مارکس بەو قسانەی کە سەدە و نیوێك لەمەوبـەر کردوویـەتی، ئـەوەمان پێئەڵێت، کە ئێمە سۆشیالستی ئەم سەردەمەین ،لەسەر سـەردەمی ئێسـتا و ناکۆکیەکانی پێویستە ئاگادارمان بکاتەوە کـە نەکەوینـە گێـژاوی  خـەیاڵ و

هەڵەوە، پێویستە ئەو ڕاستە ڕێگایە بگرین کە ئەمانباتە سەر گەڕانەوەی ژیان بۆ پرۆژەی گۆڕینی جیهان، بە پێی مەرجەکانی سەردەمی نویٚ و هەر لە ناو خۆیا نەك لەدەرەوەیدا .

لەو ڕوانگەیەوە کە باسمان کرد، دەربارەی گۆڕانکاریەکانی سەردەم و ناکۆکیەکانی، هەروەها لە ڕوانگەی ئەو ڕاستیەشەوە کە پرۆژەکەی مارکس بۆ گۆڕینی جیهان لە ناوەڕاستی ڕێگەدا پەکیکەوت و لەگەڵ خۆیا ئەزموونی سۆشیالستیشی ڕووخان، هەروەها لە ڕوانگەی ئەو ڕاستیەشەوە کە ڕژێمی سەرمایەداری جیهانیش ئەو هەموو نەهامەتیەی تووش بوو، کە چی وەك خۆی مایەوە و نەڕووخا،کە دواهەمینی ئەونەهامەتیانە ئەو دارووخانە داراییە بوو کە تائێستاش بەردەوامە،ئەمانە هەمووی سەرچاوەی واقیعیانەو بابەتیانەیە لەبەرچاوومان کە بەتایبەتی لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوو ڕاستیەوە چەپ لە جیهانی عەرەبیدا ئەتوانیٚ ڕەوڕەوەی خۆی بە شێوازێکی نویٚ بخاتە ڕیٚ بەرەو ئەوەی کە جێگەی تایبەتی خۆی وەرگرێتەوە و ڕۆڵی خۆی ببینیٚ لە پێشکەوتندا، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنیٚ کە چەپ ئەبیٚ بزانیٚ ئەو ڕێگەیەی لەبەرێتی پڕە لە کەند وکۆسپ، کە ڕەنگە هەندێك لەو کۆسپانە لە ناوەوەی خۆیدا بێت، لە لایەن چەپە کۆنەکانەوە لە چوارچێوەی هەندیك بیروڕای سیاسیدا، یا هەندێکیش لە چەپە تازەکان ببنە تەگەرە بەهۆی جیاوازی ڕەوتە سیاسی و فکریەکانەوە،ئەگەر بڵێین ڕژێمی سەرمایەداری حەتمییەتێکی مێژوویی کۆتایی نییە،کەواتە پێویستە چەپ بە تایبەتی بەناوی چەپەوە لە پێناوی پێشکەوتن و دادپەروەری کۆمەلاٚیەتیدا تێبکۆشێت، کە بەلای ئەوانەوە کە ئاماژە ئەکەن بۆ کۆتایی هاتنی مێژوو تێکۆشانێکی بیٚ سوود و بیٚ هیوایە،لەبەرانبەر ئەوەدا ئەبیٚ چەپ لە تێکۆشانیا بۆ گۆڕان خۆڕاگر بێت لەبەردەم مەرجە قورس وگرانەکانی سەردەمی نوێدا، بەلاٚم پێویستە چەپ وا

بڕوانێته گلۆباڵی سەردەم کە دیاردەیەکی مێژووییـــە و بــە ڕیـــڕەوی مێـــژوویی خۆیدا ئەڕوات، بە دوو ئاڕاستەی دژبەیەکدا، کە هەر ئاڕاستەیەو ئـەوی تـری پشتگوێ خستووە، ئاڕاستەی یەکەم لە گلۆبالیزم هەر لەسـەرەتاوە پەیوەنـدی بە گەشەکردنی سەرمایەدارییەوە هەیە، بە پێی دەرئەنجامەکانی کـە مـارکس ئاماژەی بۆ کردووە کە هەموو لایەنەکانی ژیان ئەگرێتـەوە، گرنگترینـی ئـەو دەستکەوتانەی بەدەستی هێناوە لە پێشکەوتنا لە سـەردەمی نوێـدا بریتیـە لەوەی کە لە تـەکنۆلۆژیای نوێـدا خـۆی ئەبینێتەوە،کـە پێشکەشـی هـەموو گەلان و هەموو وولاتانی کردووە، چ دەوڵەمەنـدەکان و چ هـەژارەکان، یـا چ پێشکەوتوەکان و چ دواکەوتوەکان، ئەو ڕێگەچارانەی بـۆ مـرۆڤ ڕەخسـاندووە کە لە زۆر بواردا زانیـاری دەسـت بکـەوێت، هـەروەها ئـەو تەکنیکـەی بـۆ ڕەخساندوە کە بەهۆیانەوە سوود و بـەرووبومی مـادی بەدەسـت بهێنــێ، بـە خێراییەکی بێ وێنە و بە بڕێکی گەورە و جۆرێکی باش، کە ئەمانە هـەمووی دەسکەوتی باش بون بۆ مرۆڤ و لە بەدوای یەکاهاتنی سەردەمەکاندا بۆ مـرۆڤ گواستراونەتەوە، بـەلاٚم دیوەکـەی تـری گلۆبـاڵ یـا ئاڕاسـتەکەی تـری کـە ئاڕاستەیەکی بنەڕەتییە، بریتییە لـە بەرزبوونـەوەی ئاسـتی ژێردەستخسـتن و چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایـەن مرۆڤـەوە بـە شـێوەیەکی نـوێ و بـێ وێنـە، هەروەها زیادبوونی جیاوازی کۆمەلاٚیەتی و بێ بەرانبـەری خاوەنـدارێتی کـە بەشێکی زۆر کەم زۆرترین سامانیان هەیە و بەشێکی هـەرەزۆریش بێبـەری و بێبەشن لە سـاکارترین پێویسـتیەکانی ژیـانێکی ئاسـایی، ئەمانـە شـێوازی بەردەوامی دڕندانەی سەرمایەداری گلۆباڵە کە لەگەڵ ژیانی مرۆڤ و سرووشـت و تەنانـەت هەسـارەکانی تریشـدا درێـژ بۆتـەوە، ترسـناکترین دڕنـدەیی سەرمایەداری بەکارهێنانی ئەو دەسـتکەوتانەیە لـە بـواری جۆراوجـۆردا بـۆ ژێردەستخستنی زووربەی زۆری مرۆڤ، بۆ ڕووخاندنی سروشت، لـەبری ئـەوەی

کە بەکاری بهێنن بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ و چاککردنی باری ژیانی، یا بۆ پاراستنی سروشت و ژینگە، یا بۆ پاراستنی ئەم هەسارەیە لە سووتان (مەبەستی لە زەویە — وەرگێر)، ترسناکییەکی تریش بەدی ئەکرێت ئەویش ئەوەیە کە ئەم داهێنانە گەورانە بەدەست کەسانێکی زۆرەوەیە کە لێی شارەزابوون و ئەتوانن بەکاری بهێنن، کە ترسناکییەکە لەوەدایە کە کەسانی توندڕەو و بەپەلەن کە بە هەمو دڵنیاییەوە شێوازی ئیرهابیان وەرگرتووە .

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێشەوە بۆمان دەرئەکەوێ ئەو ئەرکە مێژووییەی کە لە ئەستۆی چەپە لە دنیای عەرەبیدا ئاسان نییە، بەڵکوو زۆر قورس و گرانە، بەلاّم هیچ ڕێگە چارەیەکیشی لە بەردەمدا نییە جگە لە تێکۆشان و ڕێگرتنەبەر نەبێت سەر لە نوێ بۆ ناو ئەو ئەزموونە، بەبێ ئەوەی تەنها لە خەیاڵدا بژی و بە نەفەسێکی درێژەوە و لەسەر بناغەیەکی جیاواز و دوور لە ئەزموونی پێشوو لە هەندێك مەسەلەی جەوهەریدا ، چ لە ڕێرەوە ڕاستەکان و چ لە هەڵەکان، کەچەپی کۆن پیاڕۆشتوە واتە هیچ ڕێگەیەکی ئەوان نەگرێتەبەر، کە زۆر بە توندی پابەندی سەرووبەندی مارکس بوون، ئەم ڕبەرووبونەوە واقعیانەیە بۆ کۆسپەکانی ئێستاو ناهەمواریان لە ڕێگرتنەبەردا بەرەو پاشەڕۆژێك بە ناوی دیموکراتییەوە، ڕێگە لە چەپ ناگرێت ئاواتەخوازی داهاتوویەکی باشتر بێت، هەرچەندە بە شێوەی خەوێکی خەیالاّوی بنوێنی،بەڵکو ئەرکی چەپە لە هەمان کاتدا کە ئەو خەوە ئەبینێ پەیوەست بێت بە واقیعەوە، و ڕێز بگرێت لە تێکۆشانی خۆی لە قۆناغە جیاکاندا کە ئەرکەکان تیایاندا بە شێوەی بەش بەش یا بەگشتی جیاوازە، هەروەها لە ناوەندی ئەم تێکۆشانە قۆناغ بە قۆناغەوە بتوانێ ئەرکی هەر قۆناغێك بە وردی دیاری بکات، هەروەها درك بەوە بکات بە ئاگاییەوە کە بوون بە چەپی ئەو وەك پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی جیاوازە لە ڕووی ئەرکە

کۆمەڵایەتییەکانەوە و هـەروەها لـە ڕووی شـێوازی تێکۆشـانییەوە و کـاتی تێکۆشانییەوە، جیاوازیشە لە ئەرکەکانی چەپی کۆن،ئەرکـە هەنوکەییـەکانی ئەمڕۆی وولاّتانی ئێمە وئەو گۆڕانکاریانەی سـەردەم وای لـە بنکـەی ئەوانـە کردووە کە لەم سەردەمەدا تێکۆشان لە پێنـاوی گۆڕینـدا فـراوانتر بێـت لـە بنکە و پانتـایی ئەوانـەی لـە ئـەزموونی سۆشیالسـتی کۆنـدا تێئەکۆشـان، ئەگەر ئەو ئەزموونە کۆنە تەنها چینی کرێکاری بە بنکەی هـەڵگری پـرۆژەی گۆڕان ئەزانی، لەگەل هەندێك لە هەژارانی تـری نـاو کۆمـەڵ، ئـەوا واقیعـی ئەمڕۆی ئەم سەردەمە جیاوازە لـە ڕابـردوو، ئەوانـەی ئاواتـەخوازی گـۆڕانن زیاترن،فراوانترن، هەمەجۆر ترن و گەورەترن، تەنانەت ئەگەر لـە ناوخۆشـیاندا هەنـدێك بەرژەوەنـدی جیـا لەیەکتریشـیان هەبێت،بـەلاّم بـە هـەموویان بـە یەکگرتوویی هەست بەو ترسناکییە ئەکەن کە سەرمایەداری گلۆباڵ درووستی ئەکات لە سەریان، بۆیە پێویستیان بەوە هەیە بەیەکەوە دژی تێبکۆشـن، لـە ڕوانگەی ئەم هەستەوە و ئەم واقیعە مێژووییەوە چـەپی نـویێ مانایـەکی تـر ئەبەخشێ و پێگەیەکی جیاوازی هەیە و ڕۆڵێکی جیاوازیش ئـەبینێ فـراوانتر لەوەی ڕابردوو، کە هەموویان بە ناوی چـەپی نوێـوە تێئەکۆشـن لـە پێنـاوی گۆڕاندا، مێژووی کـۆنی چـەپ و مێـژووی تـازەی چـەپ بـە بـەردەوامبونی تێکۆشان گرێ ئەدات .

ئەم ئامـاژە خێرایـە بـۆ گۆڕانکاریـەکانی کـە ئـەم سـەردەمە بەخۆیـەوە ئەیبینێ بە هەموو ناکۆکیەکانیەوە، وا لە چەپی تازە ئەخوازێت کـە ڕەچـاوی ئەو گۆڕانکاریانە بکات و واز لەوە نەهێنیت کە خەسڵەتە بنەڕەتیـەکانی ئـەو گۆڕانکاریانە دیاری بکات، چ لایەنە باشـەکانی و چ لایەنـە خراپـەکانی بـێ جیاوازی .

# دەرگای دووەم

## نەهامەتییە ئابوورییە تازەکان و هەندێك لە دەرئەنجامەکانی

ڕژێمی سەرمایەداری جیهانی لە کاتی شۆڕشی پیشەسازیەوە لە سەدەی شانزەهەمەوە تا ئەمڕۆ لە پەرەسەندندایە، شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ی ڕووسیا و دەرکەوتنی ڕژێمی سۆشیالستی جیهانی ڕێگەی ئەو گەشەکردنەی لێ نەگرت لە قۆناغی یەکەمدا، لە قۆناغی دووەمیشدا دوای دامەزراندنی ڕێکخراوی سۆشیالستی جیهانی لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە یەکێتی سۆڤێت ڕۆڵی سەرەکی تیا بینی و ڕۆڵێکی یەکلاییکەرەوەی هەبوو، کە بەسەر فاشیەتدا سەرکەوت،هەر بەری لە گەشەکردنی سەرمایەداری جیهانی نەگرت، وێڕای ئەو نەهامەتیانەی کە زیاتر لە جارێك دنیای هەژاند، شوێنکەوتووانی ئەو ڕژێمە زیاتر لە ڕێگە چارەیەك شك ئەبەن بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانانە و سەرکەوتن بە سەریدا، باجی ئەو قەیرانانەش کەسانێکی زۆر ئەیاندا لە ئەنجامی ئەو بڕیارانەی ئەوان کە ئەیاندا بۆ نەهێشتنی کاریگەریەکانی ئەو قەیرانانە، گەورەترینی ئەو نەهامەتیانە کەزۆر کاریگەر و وێرانکەر بوو بۆ سەر جیهان، ڕووداوی ساڵی ١٩٢٩ بوو کە تاساڵی ١٩٣٣ درێژەی کێشا،ئەو نەهامەتیەی کە جیهانی بەرەو جەنگێکی سەرتاسەری ڕاکێشا و شەش ساڵی خایاند و بە

دوای خۆیدا ماڵوێرانی و کاولکارییەکی زۆری بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی جێهێشت و تا ئێستاش لە بیرەوەری زۆر کەسدا ماوە،بە تایبەتی ئەوروپییەکان کە ئامادەنین جارێکی تر کارەساتی وایان بەسەردا بێتەوە، نەهامەتی دارایی جیهانی نوێ جەخت ئەکاتەوە لەسەر سرووشتی ڕژێمی سەرمایەداری، بە تایبەی لە سێبەری گلۆبالێزمدا و،ئەو ڕژێمە بەردەوام تیایدا ئەو قەیرانانە دووپات ئەبێتەوە و بە شێواز و قەبارەی جیاواز، شارەزاکانی بوواری ئابووری و سەرۆکانی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەم نەهامەتیە داراییەی ئێستا ترسناکتر و گەورەترە لە ڕووی کاریگەرییەوە بۆ سەر ڕژێمی سەرمایەداری  بە گشتی و بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی، بەلاّم وەك بۆم دەرئەکەوێت بە پێی ئەو ڕاستییانەی کە هەن، گرنکترین هۆی ئەم قەیرانەی کە ڕوو ئەکاتە سەرمایەداری گلۆباڵ، ئەمرۆ ئەوەیە کە سەرمایە لە ڕێگەی گەشەسەندنی سرووشتی خۆی تێپەڕاندووە، ئەویاسایانەی کە پێویستە پەیوەندیەکانی مرۆڤ و لە هەمان کاتدا گەشەسەندنی ڕژێمی سەرمایەداری کە بۆ خۆی دیاریکردوە، لەو یاسا بابەتیانەش دەرچوون کە پێویستە ڕایبگرێت و نەهێلّێ بکەویتە ئەو نەهامەتیانەوە، کە ئاوا ڕایوەشێنێ و لەگەڵ خۆشیا جیهان ڕاوەشێنێت، گەورەترین و ترسناکترین تیپەڕاندنیش کە گەشەسەندنی سەرمایەداری بەخۆیەوە بینیوە ئەوەیە کە پەیوەندی پچڕاندوە بەو یاسایانەوە کە بزووتنەوەکەی ڕێك ئەخات، لە لایەك بۆ بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵ و وولاّتان و لە لایەکی تریش پارێزگاری لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، سەرمایەدارەکان بۆ بزووتنەوەی سەرمایە چەند یاسایەکی تایبەت بە خۆیان داناوە،بێ ئەوەی حساب بۆ سەرجەمی مرۆڤەکان و مافەکانیان بکەن، کە لە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە دانی پیانراوە، هەروەها

بێ ئەوەی گوێ بدەنە پەیوەندیەکان لەگەڵ سرووشتدا لەسەر ئەم هەسارەیەی کە تیا ئەژین، بەمەرجێ ئەو دەست درێژییەی کە کردویانەتە سەر سرووشت لەم هەسارەیە و لە دەرەوەی ئەم هەسارەیەشدا ترسناکیەکی زۆر گەورەی بۆ سەر تەواوی مرۆڤایەتی هەیە، یەکێکی تر لەو ترسناکیە گەورانەی کە لە ئەنجامی هەلس وکەوتو دەستدرێژی ئەوانەوە دروست بووە تێپەرینیان و زیادەڕۆییان لە سنووری نەتەوەیی و لە سنووری دوورگەیی و لە سنووری دامەزراوە داراییەکانە، کە بۆ ئەومەبەستە درووست بوون کە پەیوەندی دارایی و ئابووری ڕێك بخەن و ئەو نەهامەتیانە ڕوونەدات .

ئەم زیادەڕۆییانە لە یاسا دانراوەکان لە لایەن خاوەن سەرمایە گلۆباڵەکانەوە لە سنووری ئەقڵ دەرچووە و گەشتۆتە لووتکە،بە تایبەتی دوای قۆناغی هەرەسهێنانی ڕژێمی سۆشیالستی جیهانی، دامەزرێنەران و بیرمەندانی ڕژێمی سەرمایەداری گلۆباڵ وایان لە قەڵەمدا کە ڕووخانی ڕژێمی سۆشیالیستی جیهانی ئەو مافەی لە خەڵك سەندەوە کە خەو بە پاشەڕۆژێکی باشترەوە ببینێ لە سایەی ڕژێمێکی یەکگرتوودا بە پێی ڕێڕەوی مێژوو، ئەو سێ ئاواتەی مرۆڤ کە بریتیە لە سەربەستی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن کە سێ مافی بنەڕەتین و لە جەوهەردا بەرزترین و بنەڕەتیترینن لە تێکۆشاندا، کە هەرسێکیان لە سەدەی نۆزدەدا پێشکەوتووتر بوون لە مەرجە مێژووییەکانیاندا لەوانەی کە لە سەدەکانی پێشترا هەبوون،بەڵام کە ئەمەش بناغەیەکی بابەتیانەی پرۆژەکەی مارکس بوو بۆ گۆڕینی جیهان، کە تیووری بەردەوام بوونی ڕژێمی سەرمایەداری بووبوە تیووری کۆتایی هاتنی مێژوو لە ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەدا، بێگومان ئەمەش خراپترین بەرهەمی ئەو قۆناغە نوێیە بوو لەمێژووی جیهاندا،لەو قۆناغەدا کە خەریکی ئامادەباشی بوون بۆ

ئامادەکردنی مەرجەکانی دوای روخانی ڕژێمی سۆشیالستی، کە دوای ئەو ڕووخانە ڕێگەی جێبەجیکردنیان گرتەبەر، ئەم تیورە بێهودەییە داهینەرەکانی ملی مێژوو ملی یاسا بابەتیەکانیشیان پێ بادا و بەدوای خۆیا ئەم نەهامەتیە داراییە گەورەیەیان هێنا،کە جیهانی سەرمایەداری هەژاند و لەگەڵ خۆشیا هەڕەشە لە سەرجەمی مرۆڤ ئەکات،بە تایبەتی زووربەی هەرە زۆری دانیشتوانی جیهان بەرەو پاشەڕۆژێکی ڕەش ئەبات، ئەمەش جەختکردنەوەیەکی ترە کە ئەیسەلمێنی کە ئەم تیوورە نوێیەیان پێچەوانەی یاسا سەرەتاییەکان و بنەڕەتیەکانی ژیانە لەسەر ئەم هەسارەیە، نە ڕاست بوو نە ڕاستیش ئەبێت کە مێژوو کۆتایی بێت بە تایبەتی ئەگەر ئەو کۆتایی هاتنە مەبەست کۆتایی هاتن و ڕێگە گرتن و دەرگا داخستن بێت لە خەونەکانی مرۆڤ لە پێناوی سەربەستی و دادپەروەری کۆمەلایەتی و پێشکەوتن و خۆش گوزەرانیدا .

جیهان لە مێژووی نوێیدا جگە لە کارەساتەکانی ١٩٢٩-١٩٣٣ کارەساتی زۆری تری بەخۆیەوە بینیوە،لەوانە پڵنگە ئاسیاویەکان و کارەساتی بەرازیل وئەرژەنتین وئەمەریکای لاتینی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا،بەلاّم سەرمایەداری جیهانی توانیویەتی بە ڕێگەچارەی جیاواز بەسەر ئەو کارەساتانەدا سەربکەوێت و کاریگەریان نەهێلێ،بەلاّم ئەوەی ئاشکرایە ئەو کارەساتانەی ڕابردوو جیاوازن لەمانەی ئەم سەردەمە، ئەو کارەساتە کۆنانە لە ڕێگەی زێدەبابییەوە چارەسەر ئەکران،کاتیك کە خواست لە خستنەبازاڕ زیادی ئەکرد، هەرچەندە ئەوەش کاریگەری لەسەر زووربەی زۆری خەڵکی ئەبوو، بەلاّم گرنگ ئەوەبوو سەرمایە پارێزگاری لە مانەوەی خۆی ئەکرد، بەجۆرە خۆی نوێ ئەکردەوە و جارێکی تر لەسەر پێی خۆی ئەوەستایەوە،بەلاّم ئەمەش هەر بێ کەلێن نەبوو، بەڵکوو لەگەڵ ئەم

چارەسەرەشدا ملیۆنەها خەڵکی تووشی گرفت ئەکرد،بەلاّم کارەساتەکانی ئێستا جیاوازە و کاریگەرتر و درێژخایەنترن، تەنانەت ئەو دەرئەنجامە خراپانەش کە لێی ئەکەوێتەوە لەوەی ١٩٢٩ جەرگبڕترن چونکە ئەم کارەساتانەی ئەم سەردەمە تەنها پەیوەندی بە بەرهەمهێنانەوە نییە تا وەکوو رابردوو چارەسەر بکرێت بەڵکوو پەیوەندە بە کێبرکێی بۆرصەو نرخی موڵك و کرێی موڵك و موڵکانە وداهاتی تری داراییەوە هەیە،ئەوەش لە بەرزبوونەوەیەکی بێ مانا و بێ وێنەی نرخی سووتەمەنی و بەرووبومە نەوتیەکان و بەرزبوونەوەی نرخی کەرەسەکانی خانووبەرە و نرخی زەوی و خانوو،(کارەساتەکانی ئەم دواییەی جیهان تەنها کارگە وەبەرهێنەکانی نەگرتەوە، بەڵکوو چەندان بانك و چەندان دامەزراوەکانی دروستکردن وبەرهەمهینانی خانوبەرە و بازرگانی خانوبەرە ئیفلاسیان کرد -وەرگێر)بەم جۆرە سەرمایەداری گلۆباڵ بۆ خۆرزگارکردن لە یاسا ئاساییەکان زۆر بەتوندی لە ژێر ڕکێفی چاودێری دەسگاکانی دەوڵەت دەرچوو، ئەو چاودێرییە یاساییەی کە بە مەبەستی ڕێکخستن دانرابوو، نەك دەستکێشانە تایبەتمەندیەکان، سەرمایەداری بە پێی ئەو سەربەستیە ڕەهایەی بەخۆی دابوو دەستیدایە هەمووجۆرە کاریکی دارایی (مەبەست لە بازرگانیکردنە بە هەمووشتیکەوە کە سەرچاوەیەك بێت بۆ بەگەڕخستنی سەرمایە و پارەپەیداکردن –وەرگێر)تەنانەت ئەوانەش کە ناشەرعی و نا مرۆڤانەشن، ترسناکترینیان ئەوانەن کە کاریگەرییان لەسەر مافەکانی مرۆڤ هەیە وەك بازرگانیکردن بە کاری منداڵ و مادە هۆشبەرەکان و بازرگانی چەك وهەوڵدان بۆ هەڵگیرسانی شەڕە ناوخۆییەکان،بەمەبەستی دۆزینەوەی بازاڕی چەك فرۆشتن،هەروەها بازرگانی پارە سپیکردنەوە و هەندێك کاری تری ڕەگەزپەرستانە لە پاڵ کۆچی کۆچبەرانی ئاسیا و ئەفریقیا بۆ ئەوروپا،کە

لەدەست شەڕوشۆڕو بێکاری و بێمافی لە ولاّتەکانی خۆیانەوە کۆچیان بۆ ئەوێ ئەکرد بە ڕێگەی قاچاخ و نا دروست و سەرکێشییان بە گیانی خۆیان ئەکرد و ئەوانیش لەوێ ئەیانچەوساندنەوە لە ڕێگەی ئیشی ڕەشەوە، تەنانەت سەرکیشی سەرمایەداری گلۆبالّ گەشتە ئەوەی لە ڕێگەی کارکردنەسەر پێکهاتەکانی هەوا بەهۆی تاقیکردنەوەکانیانەوە زیان بە هەسارکانی تریش بگەیەنن نەك تەنها زەوی،لەبەر ئەوە دوور و چاوەڕوان نەکراو نیە کە جیهان بەڕووی ئەم دەستدرێژیانەدا بتەقیتەوە کە دنیای لەرزاندووە،ناشزانین تاکوێ سەرمایەداری دەستەبەری ئەوەی کردووە کە سنوورێك بۆ ئەم کارەساتانە دابنێ و جیهان لەو ئاکامە دلّتەزێنانەی بپارێزێت .

وولاّتە سەرمایەداریە گەورەکان(کۆمەلّەی بیست و بیست ونۆ و بڕیارەکەیان) هەموو توانایان خستەکار بۆئەوەی لە کاریگەریەکانی ئەم دووایییەی کارەساتی دارمانی باری دارایی ڕزگاریان ببێت، لەو ڕووەوە کۆمەلّێك بڕیاریاندا بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانە، کە هەندێکیان بەرەو ئەوە ئەچوو بیانەوێ هەژاری نەهێلّن و ڕێگە لە بلاّوبونەوەی نەخۆشی بگرن وهەولّبدەن ئاشتی بۆ جیهان دەستەبەر بکەن و ڕێگە لە بلاّوبوونەوەی چەك بگرن وهەندێك لە کێشەکانی وولاّتانی ئاسیا و ئەفریقا چارەسەر بکەن و بەر لە دیاردەی ئیرهاب بگرن، هەندێك لەو بڕیارانەی کۆمەلّەی بیست لە تیوورەکەی (کینز) ئەچوو کە پێش کارەساتی١٩٢٩-١٩٣٣ هات و لەگەلّێشیا بەردەوام بوو، کە ئەویش ئەوەبوو هەندێك ڕۆلّی چاودێری سەرمایە بسپێردرێت بە دەولّەت،بەلاّم گرەوکردن لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕێگەچارانە سنوورێك بۆ قەیرانەکە دائەنێت و ڕزگاری ئەکات، باری ئابووری و کۆمەلاّیەتی جیهان و گەلان باش ئەکات و ڕێز لە مافەکانی

مرۆڤ ئەگیرێت وچالاکی سەرمایە سنوردار ئەکرێت،گرەویکی دۆڕاو ئەبێت و چەپی نوێش ئەگەر بەو خەیاڵەوە بژین ئەوا بە هەڵەدا ئەچن،ویڕای گەورەیی قەیرانەکە و کاریگەریەکانی جیهانی سەرمایەداری ئەگەر بەماوەیەکی درێژیش بێت پێش ئەوەی کارەساتی گەورەتری لیبکەویتەوە چارەسەرێکی دیاریکراوی بۆ ئەکات بەلاّم وەك هەر کارەساتێکی پێشتر باجەکەی ئەکەوێتە ئەستۆی زووربەی خەڵك بە تایبەتی بەشە هەژارەکەی، لەبەر ئەوە ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە ئەم کارەسات و قەیرانە کۆتایی ڕژێمی سەرمایەداریە ئەوا ئەکەوینە هەڵەوە،کە ئەو هەڵەیە ئەبێ چەپ لێی بەئاگا بێت، ئەگەر بیریش لەوە بکەینەوە کە ئەم ڕژێمە ئێستا کۆتایی دێت ئەی کوا شوێنگرەوەی ؟، تەنانەت لەڕووی تیووریشەوە شوێنگرەوەیەك ئامادە نیە (مەبەست نائامادەیی چەپەکان یا ڕژێمی سۆشیالستیە- وەرگێر) لەبەر ئەوە تەنها بەدیل لە قۆناغێکی داهاتودا ڕژێمێکی سەرمایەداری باشکراوە واتە باشتر لەمەی ئێستا، جیاواز لە هەندێك ڕووەوە لە یاساکانیدا لەو یاسایانەی سەرمایەداری کە ئەیزانین، یا لەوانەیە سۆشیالستیەك بێت نەزانراو لە چۆنیەتی درووستبوون و مەرجەکانی کە دواتر پێویست بکات هێزێك هەبێت بیخاتە سەر ئەو مەرجانەی کە پێویستە،کە ئەوەش ماوەیەکی باشی ئەوێت تا دائەمەزرێت، کە ناتوانرێ پێشبینی بکرێت، بۆیە پێویستە لەسەرچەپ کە سەرکێشی نەکەن دەربارەی پاشەرۆژ و، ئەرکەکانی سەردەمەکە هەست پێبکەن و هەنگاو دوای هەنگاو بەدوای جێبەجێکردنی ئەرکەکاندا بڕۆن .

ئەم ڕونکردنەوەیەی پێشەوە ئەمانگەیەنێتە هەندێك دەرئەنجامی سەرەتایی، لەبەر ڕۆشنایی ئەو قەیرانەدا کە ئێستا جیهانی تێکەوتوە ئەو دەرئەنجامانە ئەخەمە پێش چاوی چەپی نوێ تا بەوردی لێیبکۆڵنەوە و

ئەگەر بینیان لە ڕێڕەو دەرچوە ڕاستی بکەنەوە یا لایبەرن لە ڕوانگەی خۆیانەوە چ وەك تاك یاوەك كۆمەڵ کە لە ڕوانگەی منەوە ئەمەش پێشچاوخستنەکانە:

دەرئەنجامی یەکەم : دەرئەنجامی یەکەم ئەوەیە کە ئەم سەرمایەدارییە گلۆباڵە وێڕای دڕندایەتی و ئەو کارەساتانەی کە بەسەری دێت لەگەڵ خۆیا جیهانی خستۆتە سەر ڕێگەیەکی درووست بۆ یەکبوونێکی بێ وێنە، ئەم یەکبوونی جیهانە بە تێڕوانینی من پشتی بە ڕووانگەی مارکس بەستووە دەربارەی ڕێڕەوی مێژوویی کەڵەکەبوونی سەرمایە، کە ئەمەش ڕاستییەکی مێژووییە و ئەبێ باوەڕی پێبهێنین و پشتگوێی نەخەین و کاریگەریەکانی چاوەڕوان بکەین، یەکەم دیاردەی ئەم یەکبوونی جیهانە بە پێی خوێندنەوەی من لە گەشەسەندنی کەناڵەکانی پەیوەندی و کەناڵەکانی زانستدا کە پەیوەندیان بە هەموو تووخمەکانی پێشکەوتنەوە هەیە لە هەموو بوارەکاندا، جگە لە بوارەکانی تەکنەلۆژیا کەبەخۆیەوە ئەیبینێ،ئەم پێشکەوتنەش سەرانسەریەو هەموو جیهان ئەگرێتەوە بێ جیاوازی، هەرچۆن کارەساتی دارایی بە شیوەیەکی مەوزوعیانە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەنجامە خراپەکانی بە هەمولایەکدا باڵی کێشا کە ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ جیهان لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووەوە خەسڵەتی دێیەکی جیهانیی وەرگرتوە، ئەم داننانەش بەوەی کە یەکبوونی جیهان ڕێڕەوێکی مێژووییە و وا لەگەلان ئەکات کە بیرلەوە بکەنەوە کە بەهیچ جۆرێك دوورنابن لەو گۆڕانکاریانەی کە لە جیهاندا ڕووئەدات چ بە لای چاکیداو چ بەلای خراپیدا، داننان بە یەکبوونی جیهاندا وەك ڕێڕەوێکی مێژوویی ئەوانە لەو گۆشەگیریە دەرئەکات کە خۆیان تیا حەشارداوە،وەك ناسنامەیەکی کۆن و لەدەرگا فراوانەکانەوە ئەچنە ناوسەردەمەکەوە، بێئەوەی دەست

لەوناسنامانە هەڵگرن، بەلاّم ئەبیّ ئەوەش بزانن کە ئەو پیّناسانە پیّویستی بە تەبایی هەیە لەگەڵ پیّناسەکانی تردا،ئەبیّ بگونجیّن لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی سەردەمدا، هەروەها ئەبیّ سود لەو تیّکەڵبوون و گونجانە وەربگرن، ئەو بەرەنگاریانەی کە گەشە ئەسیّنیّت بۆ بەرەنگاربونەوەی ڕژیّمی سەرمایەداریی گلۆباڵ لە ڕوانگەی جەختکردن لەسەر پیّناسەی تایبەتی لە جیاتی چوونە ناو سەردەمەکەوە و تیّکەڵبوون لەگەڵ دەستکەوتەکانی بە هەناسەیکی دریّژەوە و دژی زۆرداریەکانی بوەستنەوە، ئەبیّتە هۆی درووستبوونی واقیعیّك بە خواستی پیّناسەکانی خۆیان کە پیّناسەیەکی بکوژە هەروەك ئەمین مەعلوف لە کتیّبەکەیدا بە ناوی (الهويات القاتله) دا باسی ئەکات .

دەرئەنجامی دووەم : دەوڵەتی نیشتمانیی تائیّستاش پیّویستە بوونی هەبیّت و شویّن پیّی خۆی قایم بکات، هەروەها ڕۆڵی خۆی ببینیّ وەك ڕیّکخەریّکی ژیان، بە پیّچەوانەی ئەو بۆچونانەوە کە کە دوای ڕوخانی ئەزموونی سۆشیالستی بلاّوبوەوە کە گوایە زیاد لە پیّویست گرنگی و ئەرك دراوە بە دەوڵەت لە ولاّتە سۆشیالستەکاندا،یا لەوانەدا کە بەرەو سۆشیالستی هەنگاو ئەنیّن ، کە گوایە هەموویان شکستیان هیّناوە، سەرمایەداریی لە گەشەکردنە بیّ ویّنەکەیدا سنووری دەوڵەتی بەزاند، بە جۆریّك سەربەخۆیی بە خۆی دا کە چوە دەرەوەی سنووری چاودیّری دەوڵەت و پیّڕەوکردنی یاساکانی نەك تەنها بۆ دەوڵەتی نیشتمانی بەڵکو تەنانەت ئەو سنوور و یاسایانەشی بەزاند کە لەلایەن دامەزراوە داراییەکانی خۆشیەوە بۆڕیّکخستنی سەرمایە دانرابوون، وەك باوەڕیّکیش جوولاّنەوەی سەرمایە بەشیّوەیەك لە پیّشترا بە کارەساتی گەورەدا نەڕۆشتبیّت وگوایە ئەمانەی لەسەدەی بیستەمدا بەرەوڕوی ئەبنەوە و کیّشەی دارایی گەورە

درووست ئەکەن و قەیرانی گەورەی لێئەبێتەوە و بە زوویش کاریگەریەکانی کۆتایی نایەت، ئەمەش ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە پێویست بە بوونی ڕۆڵی دەوڵەتی نیشتمانی ئەکات لە سەردەمی گلۆباڵیشدا کە هەوڵی یەکخستنی جیهان ئەدات و ئەوە ناگەیەنێت کە ڕۆڵی دەوڵەت کۆتایی هاتووە، هەروەها ئەوە ناگەیەنێت کە سەربەستی ئەوەی پەیوەندی بە سەرمایەوە هەبێت، ناکرێت سەربەستیەکی ڕەها بێت و پێویستە سنووردار بێت و لە ژێر چاودێری یاسایەکدا بێت کە بیشیپارێزێت لە ڕوبەڕووبوونەوەی کارەساتی ترسناك کە نەهامەتیەکانی بۆ زوربەی زۆری مرۆڤەکان ئەگەڕێتەوە، بۆیە پێویستە ڕژێمێکی دیموکراتی ڕۆڵی هەبێت لە ڕێکخستنیدا، ئا لێرەدا ڕۆڵی دەوڵەت دەرئەکەوێت وپێویستی بە بوونی دیار ئەبێت، مارکس لەم ڕووەوە ئەڵێت لە ڕژێمی سەرمایەداریدا لە جیهاندا سەربەخۆییەکی ڕێژەیی چینەکان لە لایەن هێزە سیاسیەکانەوە دەرئەبڕێت، بەتایبەتی بۆ چینە سەردەستەکەی کە دەوڵەت بە پارێزەری بەرژەوەندیەکانی خۆی ئەزانێت، سەربەخۆیی دەوڵەتیش لەو دامەزراوە تەشریعی و کار ڕایکردنانەدا خۆی ئەبینێتەوە وەك کاروباری ئیداری و ئاسایش وسەربازی و ئەو ئەرکانەی پێویستە بۆ ڕێکخستنی کاروبارە کۆمەڵایەتیەکان، لە سایەی ڕژێمی سەرمایەداریدا ئەو ئەرکانە زۆرجار شلۆق ئەبن و ئاڵوگۆڕیان تێئەکەوێت، بە پێی بەرژەوەندی چینایەتی چینی حوکمڕان، بەڵام ئەرکی دەوڵەت لە ڕژێمی دیموکراتیدا ئەرکی دامەزراوەیەکی ڕێکخەرە و ڕێگە ئەگرێت لە هەموو لادانێك لەو ڕێڕەوەی کە بۆی دیاریکراوە، واتە دەوڵەت سەربەخۆییەکی تاڕادەیەکی ڕێژەیی باشی هەیە، ئەم مەرجانە بۆ ئەرکی دەوڵەت، بە پێی ئەوەی ئاماژەمان پێکرد ،ئەگەر وابوو ئەم جۆرە دەوڵەتە ئەتوانێت جۆرێك لە چاودێری بخاتە سەر جووڵانی سەرمایە، چاودێرییەك کە

نەهێڵێت لە سنووری یاسایی خۆی بچێتە دەرەوە، نەهێڵێ سنووری مافەکانی مرۆڤ پێشێل بکات، هەروەها ئیشی ئەم دەوڵەتە ئەوەیە کە ڕێگربێت لە ڕوودانی ئەو کارەساتانەی کە لە وولاّتە پێشکەوتووەکان و وولاّتە دواکەوتوەکانیشدا ڕووئەدەن، وەك کەوتنە ناو بەرەلاّیی وگەندەڵی و تاوانی ڕێکخراو بۆ دزینی سامانی کۆمەڵ و داکەوتنی هەژاری کوشندە کە زوربەی زۆری خەڵکەکەی ئەگرێتەوە، یا ژینگە ویرانکردن و دەستدرێژیکردنە سەر هەسارەکانی تر .

دەرئەنجامی سێیەم : ئەو یەکێتیە هەرێمیانەی کە لە شوێنە جیاوازەکانی جیهان دروست ئەبن، بە شێوەیەك لە شێوەکان گوزارشت لە یەکێتی جیهان ئەکەن لە لایەك و لە لایەکی تر ڕێڕەوێکی ڕاستەقینەیە بۆ دروستبوونی مەڵبەندی هێزی نوێ و گەورە، جگە لە چین کە هەڵکشاوە (الصاعد) و ڕووسیا و یابان و هند (کۆریاشیان هاتۆتە پاڵ بە تایبەتی کە ئێستا بووە خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی – وەرگێڕ) کە ئەمانە بوونەتە بەرانبەریك بۆ ئەمریکا، لەوە کەم ئەکەنەوە کە ئەمەریکا تەنها دەسەلاّتی زاڵ بێت بەسەر جیهاندا،کە ئەمەش پاڵ بەوەوە ئەنێت کە پێویست بە بوونی ڕژێمێکی ڕێکخەر هەبێت بۆ ژیانی ئابوری وولاّتان و سنوردانەرێك بێت بۆ جوولاّنی سەرمایەی گلۆباڵ و لە شێوازە دڕندانەکەی دژ بە مرۆڤایەتی وسرووشت و دەوروبەر کەم ئەکاتەوە .

دەرئەنجامی چوارەم :ئەو قەیرانە داراییەی کە هەیە وا ئەخوازێت لەوانەی کە بەنیازی گۆڕانکارین، بە ناوی چەپی نوێوە بە هەموو ڕەوتە جیاوازەکانیەوە، بە هەموو توانایان هەوڵبدەن بەرنامەیەك داڕێژن بۆ ئەو گۆرانکارییە، کە هەولێك بێت بۆ پێکەوە بەستنەوەی ئەو هەولاّنەی سەدەی ڕابردوو بۆ بەدەستهێنان بە ناوی سۆشیالستیەوە، کە دواتر شکستیخوارد

لەسەردەستی ئەوانەی کە ئەیانویست  پرۆژەی مارکس جێبەجێ بکەن لە ناو ئەو گۆڕانکاریانەی سەردەمی نوێ لە بەر ڕۆشنایی گلۆبالی سەرمایەو لە ناو بەستهێنانە زانستیەکان و لەناو کارەساتە ئابوری وداراییەکان و لە ناو کارەساتە کۆمەلآیەتی و ژینگەییەکان کە ملیۆنەها مرۆڤ باجەکەیان داوە، ئەم هەولە بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندییە لە نێوان هەموو ئەوانەدا ئەبێ بە ئاراستەیەك بێت پەیوەست بە واقیعەوە نەك بوونە یەخسیری سۆز بۆ رابردوو یا تیور و تیورکاری کوێرانە و دوور لە واقیع، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجەی دیاری ئەکرێت نەشێوێت و سەری تیانەچێت و خەونەکانی مرۆڤ جارێکی تر لەبار نەبات، ئاگادارکردنەوەی چەپ لەوەی کە بەدور بێت لەم هەڵدێرانە و وانە وەرگرتن لە ئەزموونی گەلانی تر تا نەکەوێتە هەمان هەڵەی ئەوانەوە وەك ئەمریکای لاتینی بە نموونە و بە تایبەتی کە گەلەکانیان خەسڵەتی چەپیان پێداوە و لە هەمان کاتدا بۆتە هۆی داڕووخانی ئابوری زیاتر وهەژاربوونی خەڵکەکانی و تیاچوونی مافەکانی مرۆڤ و بلاوبونەوەی سەرکووتکاری و گەندەڵی و چەوساندنەوە .

## دەرگای سێیەم

# بەرەو سیستمێکی جیهانی نوێ
# لەگەڵ ڕاگرتنی جێبەجێکردنی!

ئەو ئەرکە مێژووییەی کە مارکس پێش سەدەونیوێك دەستی پێکرد بۆ گۆڕینی جیهان، بەردەوام ئەبێتە ئەرکی نەوەکانی داهاتوو نەوە دوای نەوە، ئەو گۆڕانکاریانەش کە ئێمە ئێستا ڕەچاوی ئەکەین لە جیهانی نوێدا، ئەمانخاتە قۆناغێکی نوێوە لە جیهاندا کە پێشتر ڕووی نەداوە، بەلاٚم شێوازەکانی ئەم قۆناغە هێشتا ساوایە و دیاری نەداوە، بەلاٚم سیمای بەوە ئەچێت کە بەرەو سیستمێکی جیهانی نوێمان بەرێت، بەلاٚم ئەو سیستمە ڕونادات بەبێ بوونی هەل و مەرجێکی نوێ کە تا ئێستا توخمەکانی کامڵ نەبوون،هەرچەندە هەندێك لەو توخمانە خەریکن بە شێوازی جیا دەرئەکەون، لەوانە ئەو ئاکامەی کە ئەو قەیرانە داراییە گەورەیەی ڕژێمی سەرمایەداریی گلۆباڵ دروستیکردوە و خاوەنانی ئەو ڕژێمە هەست بە ترسناکی ئەکەن لە ئیشوکارەکانیاندا، لەوانە هەشت وولاٚتە گەورەکە و دوای ئەوانیش بیستەکە، بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو قەیرانە هەوڵ ئەدەن بڕیاری بێ وێنە بدەن (لەوانە بڕیارە ٢٩ بڕگەییەکە و ئەوبڕیارانەی دوای ئەویش) کە کۆمەڵە بڕیارێکن لە ئەنجامی ئەو کارەساتەوە وەرئەگیرێن، بەلاٚم کار لەکار ترازاوە تازە ئەو وولاٚتە سەرمایەدارانە بتوانن ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکەن .

ئەوەی من وەك خەون ئەیبینم توخم وخەسڵەتەکانی گووزارشت لە هاتنەکایەی سیستمێکی جیهانیی نوێ ئەکەن، بۆیە ئەتوانین بڵێین

شارستانیەتێکی جیهانیی نوێ بەڕێوەیە،هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکردوە، ئەو شارستانیەتە لە هەلومەرجێکی سەردەمی نوێدا دێتە ئاراوە بەو دەستکەوتە گەورانەی کە شارستانیەتەکانی پێشتر بەدەستیان هێناوە لە پێشکەوتندا، گەوهەری ئەو شارستانیەتە نوێیەش کە بەڕێوەیە لە بنەچەدا جیاوازە لەو پڕوپاگەندانەی کە هنتنگون و نمونەی ئەوان لە تیۆریستەکان ئەیکەن، کە گوایە شارستانییەتە کۆنەکان دەسەڵات و توانایان بەسەر شارستانییەتە تازەکانەوە هەرئەمێنی و شارستانیەتەکان بەردەوام لە رکەبەرێتیدا ئەمێننەوە، لە نیشانە دیارەکانی ئەو شارستانییەتە نوێیەش ئەو دەسکەوتە گەورانەیە کە زانست و تەکنۆلۆژیا و ئەدەب و هونەر بونەتە زمانێکی هاوبەش لە نێوان هەموو گەلاندا، زمانێك بۆ هەموو بووارەکان بەکاردێت، زمانێك نزیکیەکی تەواوی لە نێوان هەموو گەلاندا درووستکردوە،بەلاّم هەلومەرجی بنج داکوتانی بەستراوەتەوە بە زمانی گفتوگۆی ڕۆشنبیرییەکانەوە، تا ببێتە حەتمییەتێکی مێژوویی بۆ سەردەمێکی نوێ، گفتووگۆی نێوان ڕۆشنبیرییە جیاوازەکان تەنها بنج بەستنی ئەوشارستانییەتە جیهانییە نوێیە دیاری ناکات، بەڵکو ئەشیگوێزێتەوە بۆ شێوازێکی تر کە پێشتر ڕووی نەداوە و بێ وێنەیە لە جیهانیی داهاتوودا، کە ئەوەش وەك خەونێك ئەیبینم کە ئەو هەلومەرجە بەرەو ئەوەی بەرێت حکومەتە یەککگرتوەکان ببنە یەك حکومەتی جیهانیی، هەر ئەو پەیوەندیانەی نێوان گەلان و نەتەوەکان ڕیکبخات و ڕێز لە مافەکانیان و سەربەستییەکانیان و شێوازی ژیانیان بگرێت و ڕێز لەو ڕێگایانە بگرێت کە بەرەو پیشکەوتن ئەیگرنەبەر، ئاشتییەکی جیهانیی دابمەزرێنێت و لە هەمان کاتدا یاسای دام و دەسگاکان کێشەی نێوان وولاّتان و ناوخۆشیان چارەسەر بکات .

لە نیشانە سەرەتاییەکانی کە ئاماژە ئەکەن بۆ ئەگەری درووستبوونی سیستمێکی جیهانی لەوجۆرە، پەیوەندیدار ئەبێت بە، یەکەم : کۆتاییهێنانی

شەڕی سارد ونەهێشتنی باوی ئەوجۆرە شەڕە، دوای هەرەسی یەکێتی سۆڤێت و چوونە ناو سەردەمێکی دوای سۆشیالستیەوە لە ئەزموونی پێشویەوە،ئەوەی حەزی پێی بوو جیهانێکی ئاشتیی و جیهانێك کەمترین زوڵم و زۆری تیا بێت ، بەوەی کە بگەڕێتەوە ڕیزی وولاتە یەکگرتووەکان و دامەزراوەکانی، گەڕانەوە بۆ ناو دامەزراوە داراییەکان و ڕۆڵی نیمچە چاودێرییەکی هەبێت کە ئەمانە هەمووی ئاماژەن بۆ وازهێنان لەو جۆرە شەڕە، شەڕی سارد، وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش گۆڕا و وەك جەمسەری یەکەمی حوکمڕانی جیهان دەرکەوت، بە تەنها فەرمانڕەوایی شەڕ و ئاشتی ئەکات، وێڕای هەموو مەسەلەکانی تری جیهان، لە دوو گرێی ئەم دواییەی مێژووشدا وردە وردە بەرەو ئەوە ڕۆشت کە وەك ئیمبراتۆرییەتێکی تەنها بڕیاری چارەنووسی جیهان بدات، ئیدارەی ئەم دواییەی (بۆش)ی کوڕ وەك گوللەیەکی ڕەحمەت وابوو بۆ گیانی ئەو یەکتاییە، گوللەیەکی نەکوژ، دوای ئەو هەڵبژاردنەی باراك ئۆباما وەك کاردانەوەیەکی شەعبی وابوو لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا دژی سیاسەتی پارێزگاران، بۆ ئەوە ئەگەر بشێ سەرەتای قۆناغێکی نوێ درووست بکات بۆ سەردەمی دوای ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستی، کە قۆناغێکی هێشتا تەماوی و نادیارە، لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە هەوڵی پێکهێنانی چەند یەکێتییەکی هەرێمایەتی درا، لەوانە یەکێتی ئەوروپا،لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم یەکێتیە هەرێمایەتیانەدا و لەگەڵ ئەوەی کە چین پێی نایە قۆناغێکی تازە و پێشکەوتوو لە مێژووی گەشەکردنیدا، بارو دۆخێکی گونجاو هاتە ئاراوە بۆ دروستبونی سیستمێکی جیهانی فرە جەمسەر، سەرۆك ئوباما لەیەکەم ووتاریدا دوای هەڵبژاردنی بە چل و چوارەمین سەرۆکی وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و لە چەند ووتارێکی تریشیدا، ئەوەی ڕاگەیاند کە وولاتەکەی هاوبەشە لەگەل هەموو وولاتانی جیهاندا لەو بوارانەدا کە پەیوەندی بە مەسەلە گەورەکانی

سەردەمەوە هەیە، لە پێش هەموویانەوە پێداگری لەسەر  ئەو وولاّتانـە کـرد کـە زۆر دواکەوتوون، هـەروەها کێشـەی هـەژاریی لـە جیهانـدا، بـەردەوامیش ئـەم بابەتانە دووپات ئەکاتەوە بە شیکاری و وردەکـاری زیـاترەوە لـە وتارەکانیـا لـە هەریەك لە تورکیا و میسر و غانا و لـە ووتارەکـەیا لـە کـۆنگرەی ڕەنگـدارەکان (مەبەست ڕەشپێستەکانە — وەرگێڕ)، ڕوانگەی ئەو وا دەرئەکەوت کە ئاماژە بـۆ لەدایکبوونی یەکێتییـەکی هەرێمایـەتی گـەورە بکـات، ئـەوەی پەیوەنـدی بـەم بۆچونانەوە هەیە وەك خـەون  کۆمەڵـە کـارێکن هێشـتا لـە سـەرەتادان، بـەلاّم ئەگەری بوونیان دورە لە خەیاڵـەوە و ئـەبن بەڕاسـتی، بـەلاّم بەدەرکـەوتنی ئـەو هێمایانەی کە ئاماژە بۆ درووستبوونی ئەکەن تەنها بەس نییـە بـۆ ئـەوەی بڵـێین تــەواو دڵنیــاین کــە ئــیتر سیســتمێکی جیهــانی نــوێ درووســتبوە و نزیکــە لێمانــەوە،گفتووگۆ لەگــەڵ هاورێکانمــا لەســەر ئەوەیــە کــە ئێمــە ئەچــینە سەردەمێکەوە جیاوازە لەمەی ئێسـتا کـە هـەموو شـێوازەکانی چەوسـاندنەوە و زوڵم و زۆر لە لایەن ڕژێمی سەرمایەدارییەوە لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشـەکردنیا بەردەوام بوە، تا ئەگاتە قۆناغی سەرمایەداریی گلۆباڵیش، گفتوگۆکـان پێویسـتی زیاتری بە سەلماندن و پیادەکردن هەیە لـەو یاسـایانە و لـەو جێبـەجێ کردنانـەی بڕیارەکانی وولاّتـە سـەرمایەدارە گـەورەکانی هەشـت و بیسـتیش کـە تائێسـتا پێویستی بە کردار هەیە تا ڕاستگۆیی خۆی بسەلمێنێت، کە هیچ لەو کردارانـە تـا ئێستا ڕووناکی نەبینیوە، ئۆباما پەیمانی گەورەی داوە کە سیاسەتی وولاّتەکـەی و جیهان بگۆڕێت، بەلاّم تا ئێستا هیچ لـەو پەیمانانـەی بەجێنـەهێناوە کـە قسـەی زۆری لەسەر کردوون، لەبەر ئەوە پێویستە چـەپ بـەردەوام بێـت لـە تێکۆشـانی خۆیدا بە پێی هەلومەرجی نوێ، نەك چاوەڕوانی منەت و پەیمانی سـەرمایەداریی و ڕژێمەکەی و هێزە جیاوازەکانی بێت بە هەموو بەرژەوەندییـە جیاوازەکانیانـەوە .

# دەرگای چوارەم

## کۆسپەکانی بەردەم دروستبوونی سیستمێکی جیهانیی نوێ

چیە هەموو ئەوانەی مرۆڤ ئارەزوی ئەکات کە هەستی پێبکات ........ئەمە ئەوەیە کە شاعیرێکی عەرەب یادمان ئەخاتەوە، ئەمەش لە خوێندنەوەکانمان بۆ گۆڕانکاریەکان ڕێنیشاندەرمانە .

ئەگەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد دیاردەکانی دروستبوونی سیستمێکی جیهانی نوێ بەدی ئەکرێت ،لەبەرانبەر ئەوەشدا هەندێك دیاردەی دژ بەو دروستبوونە بەدیئەکرێت،وەك بەربەستێکی ڕاستەقینە لەبەردەم دروستبوونی ئەو سیستمەدا، سەرچاوەی ئەو کۆسپ و تەگەرانەش ڕژێمی سەرمایەداریە، کە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە پێگەی خۆی قایم بکات و سەربکەوێت بەسەر ئەو شکستانەی بەسەریدا دێت

ئەو کۆسپانە چین ؟

لێرەدا تەنها هەندێك لەو تەگەرانە باس ئەکەم بێ ئەوەی بچمە ناو درێژکردنەوەی باسەکە و گەڕان بەدوای ڕەگەکانیا، وەك هۆکار ئاماژەیان بۆ ئەکەم کە هەندێکیان بە ئاشکرا دیارن و هەندێکیشیان لە پیادەکردنی هەندێك کرداردا دەرئەکەون کە هۆ و هوکاری خۆیان هەیە .

ڕێگری یەکەم : بریتییە لەو بناغەیەی کە ڕژێمی سەرمایەداریی لەسەر درووست بوە ئەویش سیستمی چەوساندنەوە و ژێردەستخستنە، کە بەردەوام شێوازی نوێ دەهێنێتە ئاراوە بۆ جۆرەکانی چەوساندنەوە و ژێردەستخستن،

شێوازی نوێ بۆ دەستدریژی کردنە سەر سروشت و هەسارەکانی تر کە ئەمە بەردەوام هەڕەشە لە گرگرتنی زەوی ئەکات .

ڕێگری دووەم : بریتییە لەو توانا گەورەیەی کە تائێستاش هەیە لە لایەن پارێزگارانی نوێ (مەبەست لە حزبی پارێزگارانی ئەمریکایە — وەرگێڕ) بە تایبەتی لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، ئەمانە دژ بە سیاسەتەکانی ئۆباما و نییەتە پاکەکانی وەستاونەتەوە کە بەردەوام بانگەشەی بۆ ئەکات، بە تایبەتی لە وولاتەکەی خۆیدا و بەگشتیش لە هەموو جیهاندا، گەوهەری سیاسەتی پارێزگاران دەستبەسەراگرتنی هەموو جیهان و دەستکێشانە کاروباری هەموو وولاتانی ترە، هەروەها سەرکەوتنە لە پێشبرکێی خۆپر چەککردن و هەڵگیرسانی شەڕو پێکداداان و دروستکردنی ناکۆکییە چ وەك هەرێمایەتی و چ وەك ناوخۆیی، لەبەر ئەمە وێرای بانگەشەی ئۆباما و هەوڵدانی بۆ سیاسەتێکی نوێ بەلاّم سیاسەتی ئەمریکی هەروەك پێش خۆی ماوەو نەگۆڕاوە .

ڕێگری سێیەم : پاشماوەی شەڕە ناوخۆییەکانی کە ئەمریکا هەلیگیرساندوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەفریقادا، وپاشماوەی ئەو شەڕانەش کە لە هەزارەی سێیەمدا لە عێراق و ئەفغانستان هەڵیگیرساندوە، وایکردوە تائێستاش ناوچەکە ئارام نەبێت و هەموو شێوازەکانی توندڕەوی پێوە دیاربێت لە هەمووشیان دیارتر مەسەلەی تۆقاندن (ئیرهاب)

ڕێگری چوارەم : لەوەدا خۆی ئەبینێتەوە کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە دابەشبوونی ساماندا لە نێوان باکور و باشوردا کە باکور زۆر دەوڵەمەندە و بەردەوام باشوریش زۆر کەم دەرامەتە، کە ئەمە زۆر ترسناکە و بۆتە هۆی هەلگیرسانی شەڕو شۆڕ و شەڕی ئەهلی، و بەردەوام باشوور نەخۆشی و

گەندەڵی و توندوتیژی و قەرزاری باڵی بەسەردا کێشاوە و ئەمەش وایکـردوە لە ڕووی سیاسیشەوە نائارام بێت .

ڕێگری پێنجەم : لەوەدا خۆی ئەبینێتەوە کە بـەردەوام ڕژێمـی ئـەمریکی سیاسەتێکی نەگۆڕی بەرانبەر کێشەی فەلەستین هەیە، بـەردەوام ڕژێمـە یـەك بەدوای یەکەکانی ئەمریکا بە سەردەمی ئۆباماشەوە پیادەیـان کـردووە، کـە سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستانەی ئاشکرایە، بە ڕەهایی پشـتی لـووبی یـەهودی ئـەگرن و دژی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی فەلەسـتینی سـەربەخۆن بـە پێـی سنووری حوزەیرانی ١٩٦٧، ئەوەشـی کـە زۆر نامۆیـە ڕژێمـە یـەك لـەدوای یەکەکانی ئەمریکا بە سەردەمی ئۆباماشەوە ئەو ڕاسـتییە پشـتگوێ ئەخـەن کە هەرچەندە زۆر سەلمێنەری تەواو دەرکەوتوە کە تـا زایـۆنیزمی ئیسـرائیلی بـەردەوامبێت لـە داگیرکردنـی خـاکی فەلەسـتین و ناوچـە عەرەبیـەکانی تر(سوریاو لوبنـان) و تـا ئـاوا کێشـەی فەلەسـتین هەڵسـەپێرراو بێـت ئـەوا بەردەوام ناوچەکە نائارام ئەبێت و بەردەوام خەڵکانی ئیسلام و عـەرەب زیـاتر پەنا ئەبەن بۆ توندوتیژی و سەلماندنی پێناسەی خۆیان لە سنوری تایبەتمەنـدی خۆیان،و زیاتر دورئەکەونەوە لەو یەکێتییەی جیهان کە گلۆباڵ بانگەشـەی بـۆ ئـەکات لـە سـایەی سـێبەری دڕندانـەی ڕژێمـی سـەرمایەداریدا، ڕاپۆرتـە ناسراوەکەی (بیکرهملتون) ئاماژە بـۆ ئـەوە ئـەکات کـە پێویسـتە لەسـەر ئیدارەی ئەمریکی بە خێرایی چارەسەرێکی دادپەروەرانەی کێشـەی فەلەسـتین بکات و بیخاتە پێش هەموو کارەکانی تریەوە، بـە پێـی ئـەو ڕاپۆرتـە ئـەوە کلیلی چارەسەری کێشەکانی ناوچەکەیە و نایەڵێ زیاتر ترسناك بێت .

ڕێگری شەشەم :کۆسپی شەشەم بریتییە لەهەندێك کێشەی هەڵسـەپێرراوی پەیوەست بە مەسەلەی ئـاینیی و قەومییـەوە لـە ئاسـیا و ئـەفریقا لەگـەڵ وولاتە عەرەبییەکان، کە تائێستا چارەسەرکردنی ئاسان نییە، ئەمـەش شـەڕی

ناوخۆی لێئەکەوێتەوە، لەوانە سودان نموونەیەکی دیار و بەرچاوە کە هەڕەشـە لە ئاشتی ناوچەکە ئەکات .

ڕێگری حەوتەم : بە هۆی ئەوەی کە زۆر لە وولآتـانی ئاسـیا و ئـەفریقا و ئەمریکای لاتینی ژێردەستەی ڕژێمـی سـەرکوتکەر و چەوسـێنەرن و تـاوانی گەورەی دژ بە مرۆڤایەتیان تیـا ئـەنجام ئـەدرێت لەبـەر ئـەوە تـا ئێسـتا بـە هەژاری و دواکەوتوویی ماونەتەوە و هەژاری و نەخۆشی وبرسـێتی و نـاکۆکی ناوخۆیی باڵی بەسەریاندا کێشاوە .

ڕێگری هەشتەم : توندوتیژی و تونـدڕەوی ئسـوولی کـە بـە تۆقێنـەرێکی نێودەوڵـەتی ناسـێنراوە (ارهـاب دولی) دوور لـەو هۆکارانـەی بونەتـە هـۆی ڕودانی و بیانوە جیاوازەکانی بەرپابوونی،کە ئەوانەی پێڕەوی ئەکـەن زۆر بـێ ئەقلآنە و دڕندانە پێڕەوی ئەکەن،بۆتە یەکێك لە هۆکانی نا ئارامی لە ئاسـیا و ئەفریقا و زۆر شوێنی تری جیهان، لەوەش ترسـناکتر ئەوەیـە کـە ئەوانـەی خەریکن بەو کارەوە و ئەنجامی ئەدەن بونەتـە بـەکرێگیراو و خـۆفرۆش و لـە خزمەتی ئەو وولآت و ڕێکخراوە سیاسـی و مەرجەعیەتانـەدا کـار ئەکـەن و دنیایان شەڵەقاندوە و ترسناکن، لەوەش خراپتر لە زۆر حاڵەتدا بە شـێوەیەکی ڕێك و پێك وولآت  هەیە ڕۆڵی ئەو ئیرهابە ئەبینێ لە شێوازی یارمەتیدان یـا دەستخستنە کاروباری وولآتە بچوکەکانەوە لە لایـەن وولآتـە گەورەکانـەوە،یا وەك ئەوەی کە ئیسرائیل ڕەگەزپەرستانە مامەڵـە لەگـەڵ گـەلی فەلەسـتیندا ئەکات کە لەزۆر حاڵەتدا شـێوازی کۆمـەڵکوژی و لـە نـاوبردنی بەکۆمـەڵی وەرگرتوە .

ڕێگری نۆیەم : لە پێشبرکێی خۆپڕچەککردنی ئەتومیدا خۆی ئـەنوێنی لـە هەندێك لە وولآتانی جیهاندا بە تایبەتی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست و ئاسیا .

ڕێگری دەیەم : بریتییە لە پاشەکشەی هێزە دیموکراتیەکانی جیهان، بە تایبەتی چەپ، دوای ڕووخانی ئەزموونی یەکێتی سۆڤێت، لەگەڵ ئەم پاشەکشەیەشدا هەندێکیان دابەشبوون بۆ بزووتنەوەی ڕادیکاڵی و شەعبی وەك کاردانەوەیەك بۆ دڕندایەتی سەرمایەداریی وئەمەش خەیاڵخاوییەکی بەرانبەر پاشەڕۆژ دروستکردووە کە هیچ مەرجێکی ڕاستبینانەی تیا بەدی ناکرێت بۆ بەدەست هێنانی .

ئەو ناکۆکییە ڕاستەقینەیەی کە وەك دیاردەیەکی ڕاستەقینە بەدی ئەکرێت لە گۆڕانکارییەکانی جیهانی نوێ بەرەو پێکهێنانی سیستمێکی جیهانیی نوێ،کە کێشە ناوخۆییەکانی وامان پێئەڵێت و لەگەڵ ئەو ڕێگریانەش کە ئاماژەمان پێکرد دووجەمسەری جیاواز و ناکۆکن و بەرەو ئەوەمان ئەبەن کە ئەبێ گۆڕانکارییەك ڕوبدات و سیستمێکی نوێ بێتە شوێنی، ئەمە گۆڕەپانێکی ڕاستەقینەی ناکۆکییەکانە بۆ هاتنە کایەی دیموکراتیەت لە جیهاندا و بە تایبەتی لە وولاتانی ئێمەشدا،ئەمەش ئەو ئەرکە قوورسەیە لەبەردەم ئەو هێزانەدا کە ئاواتەخوازی گۆڕانن بەرەو دیموکراتیەت، بۆ دامەزراندنی سیستمێکی جیهانی نوێ ڕووبەڕووبونەوەیەکی قورس هەیە لەبەردەم ئەو هێزانەدا کە ئەبێتە مەرجی ئەو گۆڕانکاریە لە جیهاندا، ئەویش ئەوەیە کە ئەبێ هەنگاو بەهەنگاوبێت و واقیعبینانە بێت، جیاواز لەو گۆڕانکاریانەی کە ئێستا هەن و ڕووئەدەن لە جیهانێکی پڕ لە کوێرەوەریدا و پڕ لە پێکا هەڵپژان و ڕەگەزپەرستی و تۆقاندن و توندڕەوی و بێکاری و نەخۆشی و برسێتی و دوواکەوتن وشوێن خەیاڵ و شتی بێتام کەوتن کە زووربەی سەرزەمینی گرتۆتەوە،کە ئەوانە هەمووی هەڕەشەی سووتانی ژینگەی زەوی و هەسارەکانی تریشی ئەکات،ئەو مەرجە نوێیانەش کە مەبەستمە ڕێزی لێبگیرێت و ببێتە

بناغەی سەرهەڵدانی، ئەوانەی ئارەزوومەندی گۆڕانکاریەکەن ئەبێ ڕەچاوی ئەو ناکۆکییەی نێوان گۆڕانکارییەکانی سەردەمە تازەکە بکەن و بازدی بەسەرا هەڵنەدەن ئەوەش ڕەچاو بکەن کە دوو ڕیڕەوی جیاواز هەیە کە ئەوانیش کۆسپن، ڕێڕەوی یەکەم ئەوەیە کە توخمە ئیجابی و باشەکانی سەردەمەکە لە گۆڕانکاریەکاندا وا ئەبینن کە واقیعێکی بنچینەییەو هەرکارێك بەرانبەری بکرێت کارێکە ئەنجامەکانی سەرکێشی و بێ ئەنجامیە، ڕێڕەوی دووەمیش ئەوەیە کە خۆی تەسلیمی کۆسپەکان ئەکات و وای ئەبێنی کە ئەو کۆسپانە بنجیان داکوتاوە و ئیتر بۆ نەهێشتنیان واز لە تێکۆشان ئەهێنن.

ئەرکی مێژوویی چەپی نوێ لە وولاّتانی ئێمەدا، ئەو چەپەی کە هیوامان پێیەتی سەرلەنوێ هەڵسێتەوە، ئەوەیە کە توانای دانانی پرۆگرامێکی تازەی هەبێت بۆ گۆڕان، بۆ بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکاریەکان بە هەردوو لایەنی چاکەو خراپەشی، هەرکاتێك ئەو چەپە نوێیە توانی بۆ ئەوە بەرنامەڕێژیەکی نوێ بکات ئەو کاتە ئەتوانین بڵێین کە چەپەکانی ئێمە ئەتوانن هاوکاری چەپەکانی جیهان بکەن بۆ درووستکردنی بزووتنەوەیەکی نوێ، کە لە ئەزموونە کۆنەکەوە چی گرنگ و بە بەهایە وەریبگرێت و دەست لە لایەنە خراپەکانیشی هەڵگرێت، لە تێکۆشانیا ئەقلانی و واقیعیانە بێت بۆ درووستکردنی گلۆبالێکی مرۆڤانە و دیموکراتیانە و خاوەنی پرۆگرامێکی قۆناغیانە بێت کە لە هەرقۆناغێکدا سەرئەکەوێت ببێتە سەکۆی دەرچوون بۆ قۆناغێکی دواتر.

# دەرگای یەکەم

## پێشەکیەکی ڕەخنەگرانەی بنیاتنەرانە

بڕوام وایە پێویست نەکات لەم بەشەی کتێبەکەدا بچمە ناو گفتوگۆکردن دەربارەی سۆشیالستی و بیرووباوەڕی مارکس چۆن بووە و، بیرووباوەڕی لینین چۆن بوە و چۆن ئەزموونەکە بەوناوەوە بوو، هەروەها دووای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و تا کۆتایی ئەزموونەکە چۆن بوە و، ئەبێت بیرووباوەڕی مارکسی دوای ڕووخانی ئەزموونەکە ئەبێت چۆن بێت، کە هەندێك لە شوێنکەوتووانی بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە دوای ڕووخانی ئەزموونەکەش هەر لەسەر هەمان بیرووباوەڕ ماون، و وای دائەنێن کە تەنها پڕۆژەی بیٚ وێنەیە بۆ گۆڕینی جیهان، ئەم بابەتانە بەگشتی کە پەیوەندی بە سۆشیالستی و بابەتە پەیوەندیدارەکانی بووارەکانی ترەوە هەیەو کاتی زۆرتری ئەوێت، ئامانجیشم لەم ئاماژەکردنەی کە ناچمە قووڵایی ئەو باس وخواسانەوە ئەوەیە،ئەو بۆچونە نا ڕوونە لابەرم کە ناونیشانی کتێبەکە هەڵیگرتووە، ناونیشانەکە وەك ئەوە وایە کە من شێوازێکی نویٚ بۆ پڕۆژەی سۆشیالستی پێشکەش ئەکەم ، ئەو پڕۆژەیەی کە دوای سیٚ چارەکە سەدە لە درووستبونی ڕووخا ، یان باس لەوە ئەکەم کە ئەو پرۆسیسانە چیبوون کە پیادە ئەکران، لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونی سۆشیالستی و پاشەکشەکردن وتێکشکانی لە وولآتانی ئێمە و لە هەموو جیهاندا، ئەم کارە هەوڵێکی زۆری ئەوێت لە لایەن ئەوانەوە کە سەر بە بیروباوەڕی سۆشیالستین، تا

بتوانن ئەرکەکانی چەپی نوێی ئەم جیهانەی ئێمە دیاری بکەن، لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکاریەکانی سەردەم بە ڕێڕەوە دژ بەیەکەکانیەوە،ئەرکی چەپی نوێ لەم ساتەوەختە مێژوویەدا کارکردنێکی باشی ئەوێت تا بەوردی و واقیعیانە ئەو ئامانجانە دیاری بکرێت کە ئەتوانرێت بەدەست بێت، ئەو ئامانجانەی کە پەیوەستن بە چۆنیەتی گواستنەوەی وولاتانی ئێمە لە حاڵەتی دواکەوتوویی و چەوساندنەوەوە بۆ ڕێگەی سەربەستی و پێشکەوتن و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و هێنانە ناوەوەی یاساکانی دیموکراسیەت بۆناو دەسگاکان و دامەزراوەکانی حکومەت و کردنیان بە بەشێك لەو گۆڕانکاریانە، ئەمانە بەشێك نین لە ئەرکەکانی بانگەشەی دامەزراندنی سۆشیالستی و یا ئەوانەی پەیوەندییان پیوەی هەیە وەك سستمی ئابووری و کۆمەلاّیەتی، ئەوانە وەك وتم سەردەمێکی ئەوێت کە جاریٚ زووە و ئاماژەکانی دەرنەکەوتوون و پێویستی بە بوونی ئەو مەرجانە هەیە کە هێشتا توخمەکانی پێنەگەیشتوون .

لە ڕاستیدا هەردوو وشەی (سۆشیالستی) و (چەپ) لە لێکدانەوەکەی مندا دەربارەی چەپی نوێ لە وولاّتانی ئێمەدا بیروباوەر و پڕۆژەیەکی پاشەڕۆژە، بێگوومان پەیوەستن بەیەکەوە ،لە لای من لەڕووی باوەڕەوە، کە ئەوە ئەرکێکی مێژووییە، بیروباوەڕی مارکس، پێویستە چەپ هەڵپەی بۆ بکات و بیبەستێتەوە بە بیروباوەڕی سۆشیالستیەوە،، لە ڕووی ڕەوشت وبەها مرۆییەکانەوە، لە هەمان کاتدا خۆی ڕزگار بکات لەو بیرووباوەڕە کۆنانەی کە بەسەرچوون، لە کاتێکدا کە ئاماژە بۆ ئەمە ئەکەین ئەمەوێت خوێنەر ئەوە بزانێت ئەو بیرو ڕایانەی لەم ڕووەوە پێشکەشی ئەکەم بەرهەمی ئەزموونی خۆمە چ وەك تەمەن وئەزموون و چ وەك شیوعییەکی قاڵ بوو کە پوختەم کردوون دەربارەی نوێبونەوە و ئەو بیروبۆچونانەی

پەیوەندیدارن بە گۆڕانکـاری سـەردەمەوە، هـەروەها ئـەو ڕووداوانـەی کـە جیهـان بـە خۆیـەوە ئـەبینی لـە هـەموو بووارەکانـدا، مـن لێـرەدا وەك سۆشیالستییەك ئەدوێم بە پێی مێژووی پەیوەندیم بەو بیروبـاوەڕەوە، بـەڵام جیاوازم لـە بەشـێکی زۆر لـە بیروباوەڕەکـانی مـارکس کـە بەسەرچـوون و بوونەتە بەشێك لە مێژووی کۆن، بـەڵام ئـەو جیاوازیـەم ئـەو پەیوەندییـەم ڕەتناکاتەوە کە لەگەڵ مارکسدا یەك خەون ئەبینین و هەمان ئامانجم هەیـە کە ئەویش پرۆژەی گۆڕینی جیهانە، لەگەڵ هـەموو ئـەو نوسـینانەیدام کـە ژیانی خۆی بە درێژایی بۆ تەرخانکردبوو دەربارەی جەختکردنـەوەی لەسـەر مرۆڤ و بەهای مرۆڤ چ وەك تاك و چ وەك کۆمەل، کە گەوهەری ژیانن و لە گەڵ ئەو ئامانجانەیدام کـە دەربـارەی پێشـکەوتن لـە هـەموو بووارەکانـدا ئاواتی ئەخواست، من وەك سۆشیالستییەك باسەکە نزیـك ئەکەمـەوە لـەو ئەرکە هەنووکەییانەی کە پەیوەندیان بە وولاّتانی ئێمەوە هەیە، ئەوانەی کە پەیوەندییان بە پاشەڕۆژەوە هەیە، بە شێوەیەکی واقیعیانەو جیاواز لە ڕووی شـێواز و تێگەشـتن لـە ئامرازەکـانی،منیش و هاوڕێکانیشـم لـەو سۆشیالستانەی پێشتر وەکوو من گەشتوونەتە هـەمان تێگەیشـتن بـە پێـی ئەزموونی پێشتریان لە ژیانی سیاسی و پیادەکردنی سیاسەتدا، کە شـیوعی یەك سەردەم بووین ، بۆ ئەوەی ببینە سۆشیالستی ئەم سەردەمە بە تایبەت لـە ولاّتـەکانی خۆماندا،بۆیـە واپێویسـت ئـەکات زۆرجـار جیـاواز لـە بیرکردنـەوەی کۆنمـان،ڕێزی یاسـا بابەتیـەکان بگـرین، ڕەچـاوی مەرجـە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە بکەین کە ئێمـەی تێـداین و مەبەسـتمانە لـە بارەیەوە بدوێین و ئەرکەکانی خۆمان لە وولاّتەکەماندا دیاری بکـەین، مـن وەك سۆشیالستییەکی ئەمرۆ، پەیوەست بە ڕەوشت و بەهای سۆشیالستیەوە وەك بیروبـاوەڕی مارکس،کـە گرنگـی داوە بـە سەربەسـتی و پیشـکەوتن

ودادپەروەری کۆمەلآیەتی کە ئەمانە پڕاوپڕی ویستەکانی مارکس بوە لە گۆڕینی جیهاندا ..

من وای ئەبینم ئەوەی دەربارەی ئەرکەکانی ئێستاو پاشەڕۆژی مێژوومان پێشنیازی ئەکەم، نەلە شێوە و نە لە ناوەڕۆکدا هیچ پەیوەندیەکی بەو بنەما ڕووخاوانەی ئەزموونی سۆشیالستییەوە نییە، بەلاّم بەردەوام لە مەرجە نوێکاندا پشت ئەبەستم بە مەتەریالزمی جەدەلی پرۆگرامی مارکسەوە، ئەیکەمە دەسپێکی هەر گفتوگۆیەك کە پێشنیاری ئەکەم و پەیوەندی بە ئێستاو داهاتووەوە هەبێت، بۆ نموونە من سۆشیالستێکم بە مانای تیوری و یووتووبیا، ئەرکی لە پێش، لای من بنیاتنانی دەولّەتێکی دیموکراتی نوێیە کە بەردەوام پەرە بە دیمووکراتیەت بدات، ئەو دەولّەتە دیمووکراتیە نوێیەش دروست نابێت لە شێوازیکی یاساییدا و بەشێوەیەك کە ئەرکەکانی لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا بەپێی ئەو پرۆسیسانە بێت کە ئەبێ پێی هەستێ،بە دروستبوونی دەولّەتێکی ماف و یاسانەبێت (Etat de Droit) (دەستەواژەیەکی فەرەنسییە بە مانای دەسەلآتی یاسا دێت - وەرگێڕ) وولآتی دامەزراوە دیموکراتیەکان، دەولّەتێك کە مافەکانی مرۆڤ چ وەك تاك و چ وەك کۆمەلّ تیایدا پاریزراو بێت و سەربەستیەکانی دەستەبەر بێت، مەبەست لەم وتەیە بێ چەندوچوون، لە دیاریکردنی پێشینەی ئەرکە تایبەتیەکانە لە وولآتی ئێمەدا، ئەویش ئەوەیە ئەبێ هەست بەوە بکەین کە دوو ڕێگەی تەواو جیاواز هەیە لە تێکۆشان لە پێناوی گۆڕاندا کە ئەویش : یەکەم / ڕێگەی مارکس، واتە واقیعیانە هەولّدان بۆ گۆڕینی دیموکراتیانە، کە بەوردی ڕیزبەندی جیاوازیەکانی قۆناغەکان ئەکات، لە گەلّ جیاوازی مەرجە مێژووییەکان و جیاوازی ئەرکەکانی قۆناغێك لەگەل قۆناغێکی تردا، ئەم ڕێگەیەی مارکس ئەو

ڕێگە واقیعیە پەسەندەیە کە مـن لـە ژیـانی سیاسـیمدا پیـادەم کـردووە و باوەڕم پێیەتی،ڕێگەی دووەم /لە ئەدەبیاتدا ناسراوە بە ڕێگەیـەکی شـەعبی کە هەرخەریکی بەرزکردنەوەی درووشمن بەبێ ئەوەی مەرجـە مێژوویـیـەکان لەبار بن بۆ بەدیهێنانی ئەو دروشمانە، ئەمەش شوێن کەوتووانی پـەلکێش ئەکات بۆ نشووستی و سەرەڕۆیی، لە ئەنجامدا کۆمەڵ بردن بەرەو هەلـدێر، نموونەیەکی لینین دێتەوە یادم ئـەویش ئەوەیـە کـە لـە لوتکـەی سـەرەوەی سێگۆشـەی دەسـەلاتی کرێکـاران و جوتیارانـدا بـوو دوای چـوار سـاڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و ئەنجامی ئـەو وانانـەی لـە شـەڕی ئـەهلی فێری بوبوو دەربارەی (جـەنگاوەرێتی شـیوعیەکان)، کـە بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە ئـەرکی بەلشـەفیەکان لـەو قۆناغـەدا بـۆ پارێزگـارێکردن لـە دەسەلاتی سۆڤێتی و بۆ بەدیهێنانی سەربەستی و پیشکەوتن و دادپـەروەری کۆمەلایەتی، دامەزرانـدنی سـەرمایەداریی دەوڵەتـە . ئـەوە ئـەرکی ئـەو قۆناغـەیە بەلای لینین و بەلشەفیەکانەوە کە بریتیە لە بنیاتنانی بناغەیەکی مادیی بۆ پێشکەوتن و بەبی ئەو بناغەیە هەرگیز نابێ باس لـە پاشـەڕۆژی سۆشیالستی ڕوسیا وئامانجە چاوەڕوانکراوەکانی لینین بکرێت .

کەواتە جیاوازی نێوان ئەو دوو مێژووە، مێژووی ئەزموونە ڕووخاوەکـەی سۆشیالستی و مێـژووی ئێسـتا کـە ئێمـە تیایـداین هەیـە و جیاوازیـەکی سرووشتیە و ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەیە کە جیهان لەو ماوە دورو درێـژەدا بە خۆیەوە بینیوە لە سەرەتای سەدەیەکەوە تا کۆتایی، بۆیە جیـاوازی ئـەو دوو ڕێگایەش دروستە و بواری ئینکاری و چەندو چـوونی تێـدا نیـە، هـەر ئەمەش بوو لینین ئاماژەی پێکردبوو لە سەرکەوتنی شۆڕشدا، لـە ڕاسـتیدا مارکسیش جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە بەرنامەیەك ناوی سۆشیالستی هەلگرتبێت سەرهەلنادات لە ئاستی ئـەو واقیعـە مێژوویـیـەوە نـەبێت کـە

تیایەتی و ئەگەر وانەبێت سەرکەوتن بەدەست ناهێنی و پەیوەندی بە سۆشیالستیەوە نامێنی، ئامانجی گەوهەری مارکسیش لەم دڵنیاکردنەوەیە ئەوەیە، لای مارکسیش و لای لینینیش وایە کە پێویستە پەیوەندییەك هەبێت لە نێوان ئەرك و واقیع و توانادا، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکە لەو ترسناکییانەی کە پاڵ بە جەماوەرەوە ئەنێت و ئەیخاتە تێکۆشانێکەوە کە ناتوانێت ئەو درووشمانەی بەرزی کردۆتەوە بەدیبهێنێت، ئەمەش ئەبیچتە هۆی ئەوەی کە بێهیوایی و ساردبونەوە لای ئەو جەماوەرە دروست بکات لە بەدەستهێنانی گۆڕانکاری و مەرجەکانی ژیاندا، جەماوەریش کە تووشی بێهیوایی بوو ئەکەوێتە بەردەم دوو هەڵبژاردنەوە کە ئەویش : یا چاوەڕوانی ئاسودەیی پاش مردن ئەکات یا ئەوەیە کوێرانە ئەبێتە ئامێرێك لە خزمەتی دواکەوتن و وێرانکاری وئەمەش بە ئاشکرا بە وولاتانی ئێمەوە دیارە لە شێوازی ئیرهابدا و لە زۆر وولاّتانی تریشدا نموونەی هەیە .

گەوهەری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە مەرجە مێژوویەکان ناوەڕۆکی ئامانجەکان دیاری ئەکەن، کە وا لە پرۆگرامی گۆڕان ئەکات کە هەموو قۆناغە مێژوویەکان بگرێتەوە لە هەر وولاّتێکدا، لەوانەش وولاّتانی ئێمە، هەروەها ئەو مەرجانە ئەو هێزە خاوەن بەرژەوەندیانە دیاری ئەکات کە هەلئەستن بە بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان و شێواز و ئامراز و هۆکارەکانی دیاری ئەکات دوور لە خەیاڵ و بە شێوەیەکی واقیعیانە.

با هەندێك بگەڕێینەوە لای مارکس و ئینگلس لە پێناوی دڵنیاکردنەوەی ئەوانەی کە لەم جۆرە قسانە ئەترسن

مارکس و ئینگلس لە پێشەکی چاپی ۱۸۷۲ ی بەیانی شیوعیدا، واتە پاش ۲٤ ساڵ لە دەرچوونی بەیانەکە ئەڵێن :

((ئەم بەیانە خۆی پرۆسەی جێبەجێکردنی بە بەردەوامی و لە هەموو شوێنێکدا مەرجدارە بە پەیوەست بوون بە مەرجە مێژووییەکەوە، بۆیە ئێمە هیچ لە بەهای تایبەتی گرتنەبەری کاری پێویستی شۆڕشگێرانە هەڵناسپێرین کە لە کۆتایی بەشی دووەمدا پێشنیارمان کردووە، ئەگەر بمانویستایە ئەمڕۆ ئەو بڕگەیە بنووسینەوە بە شیوەیەکی جیا لە زۆر ڕووەوە ئەماننوسی .....))

ئینگلس لەو پێشەکیەدا کە ساڵی ١٨٩٥ نوسیوویەتی و لە هەمان ساڵیشدا کۆچی دوایی کرد،بۆ پێشەکی کتێبەکەی مارکس (پێکهەڵپژانی چینایەتی لە فەرەنسا) کە ساڵی ١٨٥٠ نوسیویەتی و لە بارودۆخی شۆڕشەکەی فەرەنسا ١٨٤٨-١٨٥٠ و ئەنجامەکانی ئەو شۆرشە ئەدوێ کە پێی گەیشت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە چاوەڕوانی بوو لە شۆڕشی کەمینەوە ببێت بە شۆڕشی زۆرینە ئەڵێ:

(مێژوو ئەوەی بۆ ئاشکرا کردین کە ئێمەو هەموو ئەوانەش کەوەك ئێمە بیر ئەکەنەوە لەسەر هەق نەبووین، بە ئاشکرا دەرکەوت کە گەشەکردنی ئابووری لە دورگەی ئەوروپادا و لەو کاتەدا ئەوەندە پێنەگەشتبوو کە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی ڕەتبکاتەوە )

هەروەها لە هەمان پێشەکیدا دوای ئەوەی هەموو ئەو بارودۆخەی هاوکات بوون بۆ بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکان زیاتر لە وولاتێکی ئەورووپیدا، لەو قۆناغەدا ئینگلس گەشتە ئەو قەناعەتەی کە بڵێ :

(لە ڕووی مێژووییەوە هەڵەمان کرد، دەرکەوت تێڕوانینمان ئەوکاتە وەهم بوە)

هەر لەو ڕووەوە زیاتر لەسەری ئەڕوات و ئەڵێ:

(تەنها دۆزینەوەی هەڵەیەك نەبوو بەڵکو بە تەواوی ئەو مەرجانەی پرۆلیتاریا بۆی تێئەکۆشا قلّپ بووەوە)

ڕەنگە پێویستمان بەم نموونە هێنانەوانە نەبێت لـە مـارکس و ئیـنگلس و لینین، لەگەڵ گرنگی زۆریشـیاندا، تـا بـزانین مەرجـە مێژووییـە گۆڕاوەکـان ئەوەیە کە پێویستە پشتی پێببەستین ولێوەی سەرچاوە بگرین بۆ دیـاریکردنی ئەرکە گرنگەکانی تێکۆشان لـە پێنـاو گـۆڕینی جیهاندا،لـەم واقیعـەوە کـە ئێستا تیایەتی بـەرەو ڕوانگەیـەکی بـەرزتر لـە ڕووی ئابووریيـەوە تـا زیـاتر دادپـەروەری کۆمەلاّیـەتی و زیـاتر ڕێزگـرتن لـە مافـەکانی مـرۆڤ و سەربەستییەکانی و ئارەزووەکانی بەدەست بهێنین، ئـەو مـاف و سەربەسـتی و ئارەزوانەش بەدینایەت لە سایەی دەوڵەتی یاسادا نەبێت، ئەو ئالۆزییە فکـری و سیاسییەی کە وولاّتانی ئێمە بەخۆیەوە ئەیبینیێ، بە تایبـەتی لای هەنـدێك جوولاّنەوەی کە تائێستاش خۆی بە هەڵگری فکری سۆشیالستی ئەزانێت، یـا هەندێك خۆیان وا لە قەڵەم ئەدەن، هەروەها ئەو ئالۆزییەی کە بـاڵی کێشـاوە بەسەر بیروباوەڕی هەندێك ناوەندی بیرمەندە مارکسـیەکاندا، یـا ئەوانـەی وا خۆیان نیشان ئەدەن کە هەڵگری فکری مارکسین، بە هەردوو لادا چ فکـری و چ سیاسی، وامان لێئـەکات کـە هەنـدێك لـە بیرووڕاکـان و هەڵوێسـتەکانی مـارکس و ئیـنگلس و لینینیـان یـاد بخەینـەوە، کـە جـەخت لەسـەر ئـەوە ئەکەنەوە، کە هەر سەردەمێك بیرکردنـەوەی خـۆی هەیـە کـە مەرجـەکانی سەردەمەکە دیاری ئەکەن، وئەو ئامانج و پرۆگرامانـە هێـزی تایبـەتی خـۆی هەیە لـە پێناویـدا تێئەکۆشـێت، هـەروەها پێویسـتی یادخسـتنەوەی ئـەو بیرووباوەڕانە ئەمانگەیەنێتە پێویستی ئەوەی لەو دۆخـە چەقبەسـتوە دەرچـین کـە بـاڵی کێشـاوە بەسـەر وولاّتەکـەمان و ژیـان تیایـدا، لەوانـە بـوواری بەرهەمهێنانی پرۆژەی نویێ بۆ دیموکراتیەت، جا ئەو دەربازبوونە لە چەقبەستن چ بە ناوی مارکس و پرۆژەی سۆشیالستیەوە بێت بە شێوازێکی نـویێ یـا لـە ژێر هەر ناوێکی تردا بێت بە هـەمان ئاڕاسـتەدا، کـە لـە ئەنجامـدا نـەهێڵێ

ڕژێمە سەرکووتکارەکان بەردەوامبن، کە ساڵانێکی زۆرە وولاٌتەکانمان پێوەی ئەناڵێنن و دوواکەوتنێکی ئابووری و کۆمەلاٌیەتی خستۆتەوە، و تێکشکانە سەربازییە یەك لەدوای یەکەکانیان کە سەرکردەکانی ئەم ولاٌتانە و هاوپەیمانەکانیان لەگەڵ ئیسرائیلدا بەدەستی ئەهێنن لە ژێر درووشمی درۆزنانەدا (هیچ دەنگێك لەسەروو دەنگی شۆڕشەوە نیە) بۆتە هۆی دروستکردنی داڕووخانی دەروونی و بێهیوایی لای نەتەوەکانمان، بە تایبەتی لای گەنجان و بێهیوایی بەو گۆڕانەی کە نیازخوازن بۆی و بەدەست نایەت، هەر ئەمەش بۆتە هۆی زاڵبوونی ئارەزو و غەریزە بە سەر ئەقڵدا و بە هەڵسووکەوتی زۆرکەسەوە دیارە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، لەگەڵ ئەوانەشدا ڕوداوی دڵتەزێنی تر کە بوونەتە هۆی پاشەکشەی هەست و دەسەلاتی هەست لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا و شوێنگرتنەوەی لە لایەن هەستێکی ساختەوە کە ئەمەش بۆخۆی بۆتە هۆی ناشیرینکردنی ئارەزووەکان و بردنی بەلای شتی خوورافی و غەیبیدا، ئەم دۆخەش بۆخۆی ئەبێتە زاڵکردنی بیرو باوەڕی کۆن و سەلەفیەت و ڕەگەزپەرستی وخۆبەستنەوە بە خەیاڵەوە، بە هەمان شێوە پەیوەست بوون بە دەقەکانی مارکسەوە لە دەرەوەی سنووری موناقەشەو گفتوگۆ و سەیرکردنی وەك دەقی پیرۆز بە هەمان شێوەی ڕەگەزپەرستی و توندڕەوی ئاینیە سەبارەت بە دەقە پیرۆزەکانیان، بە تایبەتی کە ئاین بەکار بێت بۆ پێچەوانەی ئامانجە ڕۆحیەکەی و ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویدا درووست بوون، کەوتنە داوی پیرۆزسەیرکردنی دەق دەرگا لەسەر هەڵگری ئەو بیروباوەڕانە دائەخات و دەرگای ئەوەشی لەسەر دائەخات کە هیچ نوێیەك قبوول بکات لە هەرلایەکەوە بێت، هەروەها لاوازیان ئەکات بەرانبەر هەڵسوکەوت لەگەل نوێدا بە شێوازێکی ڕەخنەگرانە و ڕوانین بۆ پاشە ڕۆژ، ئەم ئەقڵیەتەش بە تایبەتی لای سەرکردەکان لە پیادەکردنی سیاسەتدا ڕۆڵی

یاسا بابەتیەکان پەکئەخات و لەم کاتەشدا دەرگای سەرکێشی والآیەو کۆمەڵگە بەرەو داچوون و نەهامەتی ئەبات و پرۆسەی پێشکەوتن پەکئەخات و دووری ئەخاتەوە لە ڕێگەی سەربەستی و دادپەروەری کۆمەلآیەتی و خۆشگوزەرانی کە مرۆڤایەتی لە بەرەبەیانی مێژووەوە خەونی پێوە ئەبینێ.

لەم بەشەی کتێبەکەدا هەوڵ ئەدەم هەندێك پێشنیار پێشکەش بکەم دەربارەی ئەرکەکانی ئێستاو داهاتوو سەبارەت بە وڵاتەکەمان، لەو ڕوانگەیەوە کە چی هاوبەشە و بەرژەوەندی هەمووانی تیایە، ئەم پێشنیارانە چ وەك زمان و چ وەك ووتار لەو جۆرە نییە کە سۆشیالستەکان لەسەری ڕاهاتبوون لە دارِشتنی بەرنامە و دیاریکردنی ئەرکەکاندا، کە باسی زمان ئەکەم مەبەستم ئەو زمانەیە کە سەرکردەی شیوعی شەهید (فرج الله الحلو) و هاوڕێی تێکۆشانی (نقولا شاوی) کە لە نووسینەکانیاندا و لە ڕاپۆرتەکانیاندا لە کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی حزبی شیوعی لوبنانیدا لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا بەکاریان ئەهێنا، یەکەمیان لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا شەهید بوو دووەمیشیان لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا کۆچی دوایی کرد،ئەوان هیچ کام لە وتارە مارکسیە باوەکانیان بەکار نەئەهێنا لە نووسینەکانیاندا،یا لە ڕاپۆرتە سیاسیەکانیاندا کە بۆ ڕێکخراوەکانیان ئامادە ئەکرد و لە کۆبونەوەکانی دەستەکانی سەرکردایەتیدا پێشکەشیان ئەکرد، بە هیچ شێوەیەك ووشەی سۆشیالستی دەرنەئەکەوت، ئەمەش کەموکوڕیەك نەبوو لە ڕۆشنبیریی مارکسیی ئەواندا، یا کێشەیەك یا دڵساردییەك هەبێت لە بیروباوەڕی ئەواندا بەرانبەر بە سۆشیالستی، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە پێویست بوو وەك هەڵوێستی سەرکردەیەکی شیوعی لەو قۆناغە مێژووییەی لوبناندا،لەبەر ئەوەی خەمی سەرەکی ئەم دوو سەرکردەیە جەختکردن بوو لەسەر مەسەلە سەرەکیەکان، ئەوانەی کە بەردەوام

پەیوەندییان بە ئێستاوە هەبوو، کاتێك لـە ژێـر سـەرکردایەتی فـەرج اللـە دا کارم ئەکرد لە ڕۆژنامەی ئەو کاتەی حزب (النور) لە دیمەشـق و (النـداء) لـە بەیروت، ئامۆژگاری ئەکردم کـە لـە نووسـینەکانمدا خـۆم بـەدوور بگـرم لـە بەکارهێنانی ئەو ووشە و دەستەواژانەی کە دوورمـان ئەخاتـەوە لـە ئامانجـە هەنوکەییەکە و خوێنەر دوور ئەخاتەوە لەو ئامانجەی کە مەبەستمانە، لە ئـان وساتێکی دیاریکراودا، ئەم دوو سەرکردە شیوعییە لایان وابـوو بـەکارهێنانی دروشمی قەبە کە ختوکەی هەستی مرۆڤ بـدات و مەرجـەکانی بەدەسـتهێنانی ڕاستەقینەی ئامادە نەبێت، جۆرێکە لە هەلپەرستی و بـە ڕەهـایی دوورە لـە مارکسـیەتی مارکسـەوە، هـەروەها لـە ڕێبازەکـانی لینینـەوە و دوورە لـە دیاریکردنی ئەرکە هەستپێکراوەکاندا، ئیتر لە قۆنـاغی تێکۆشـاندا بێـت بـۆ گەشتن بـە دەسـەڵات یـا بـۆ پارێزگـاریکردن لـە مانـەوەی دەسـەڵات دوای سەرکەوتنی شۆڕش، یەکەمین ئامانجی بنەڕەتی لای لینین لە سەردەمی خۆیدا و لای ئەم دوو سەرکردە شیوعییەش ئەوە بووە کە دەسـتەبەری ئـەو مەرجـە ماتەریانە بکەن کە لە تێکۆشانێکدا بە شـێوەیەکی واقعیانـە ئەیانگەیەنێتـە ئامانجە دیاریکراوەکان .

لە هێنانەوەی ئەم دووسەرکردە شیوعیە لوبنانیانەدا بـە نموونـە کـە دیـار بوون لە ڕووی فکری و سیاسی و سەرکردایەتی کردنیاندا،مەبەستم ئەوەیە کـە خوێنەر ئاگادار بکەمەوە لەوەی کە مـن ئـەو پێشـنیارانە پێشـکەش ئەکـەم دەربارەی ئەرکە هەنوکەییەکان و ئەرکەکانی پاشەڕۆژ لە وولاتـانی خۆمانـدا، کە ئەرکی هەموو سۆشیالستەکان و هەموو ئەوانەشـە کـە خۆیـان بـە چـەپ ئەزانن و هەموو دیموکراتخوازەکانیش بە هەموو ئاڕاستەکانیانەوە، ئەوەیە کـە بە هیچ جۆرێك ووشەی سۆشیالستی لە هیچ شوێنێکی ئەو ئەرکانـەدا بـەکار ناهێنم، من لێرەدا ڕێڕەوی لینین ئەگرم کە لە بەرنامەی دەسـەڵاتی سـۆڤیتیدا

پیادەی کردبوو کە ناسراوە بە (سیاسەتی ئابووری نوێ) ئەو وایئەبینی کە باسکردنی ئەرکە سۆشیالستیەکان تەنانەت لە ژێر دەسەلاتی کرێکاران و جوتیارانیشدا لەو مێژووەدا دەرچوون بوە لە واقیع، بەڵکو ئەو هەوڵی ئەوەی بوو لەو سەردەمەدا بناغە ماتەریەکانی گەیشتن بە سۆشیالستی دامەزرێنی، ئەو بناغەیەی کە کرێکاران و جوتیاران لەو قۆناغەدا بە تەنیا نەیانئەتوانی دایمەزرێنن، لەبەر ئەوە لینین پەنای بۆ سەرمایەی ڕووسی و سەرمایەی دەرەوە برد بۆ گەشتن بەو ئەرکە مێژوییە، لەو سیاسەتەدا سەرکێشیکرد بە ئەگەری دۆڕاندن وشیوعیەکانی خستە بەردەم ئەو ئەگەرەوە، هەروەها بانگی ئەکردن بۆ فێربوون لە دوژمنانی چینەکەیانەوە چوونکە بۆ ئێستاش و داهاتووش سودی لێوەر ئەگرن، تا دەسەلاتی سۆڤێتی زەرەرمەند نەبێت لەو جەنگە مێژووییە گەورەیەدا، لینین لەو سەردەمە مێژوییە گرنگەدا، یەکەم مێژووی دەسەلاتی سۆڤێتی، بە ناوی سۆشیالستیەوە جوانترین نموونەی داهێنانی پێشکەشکرد لەمەڕ ئەرکەکانی گۆڕانەوە، کە پێویستە لە سەر سۆشیالستەکانی ئەمڕۆ بە تایبەتی لە ئاستی ڕوانگە و ڕێڕەوە جیاوازەکانیانەوە چاو لەو بکەن بۆ دیاریکردنێکی واقیعیانەی ئەرکەکانی گۆڕان لە وولاتەکانیاندا، لە گەڵ دیاریکردنی ئەو ئامرازانەی کە لە تێکۆشاندا ئەیانگەیەنێتە بەدەستهێنانی ئەو ئەرکانە .

لە کۆی ئەو ئەرکانەی لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا خراوەتە ئەستۆمان، ئەوەیە کە بە هەموو توانامانەوە هەوڵ بدەین بۆ دامەزراندنی هەڵسانەوەیەکی نوێ لە وولاتەکانماندا، هاوکار بین بۆ هەڵسانەوەی هەوڵە وەستاوەکەی کە بیرمەندانی هەڵسانەوەی یەکەم پێشکەشیان کرد لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئەو ڕاپەڕینەی کە خنکێنرا و زۆر هۆکاری ناوەکی و دەرەکی هاوبەشیان کرد لە تاساندنیا، کە ئسوولێی ئاینی

کۆنەپەرست و هەندێك جار یەککگرتنیان لەگەڵ دەسەڵاتە سەرکوتکەرەکانی ناوەوەدەرەوە،رۆڵێکی گەورەیان بینی بۆ لەناوبردنی ئەو ڕاپەڕینە،هەروەها زووربەی ئەو هێزانەی ڕاپەڕین بۆ شوێنکەوتنی پرۆسەی سۆشیالستی قەومی لە قۆناغەکانی دواییدا بە خۆیان بزانن یا نا لە مەرجە مێژووییە نوێکەدا بوونەتە کۆسپ لەبەردەم بوژاندنەوە و هەڵسانەوەدا،هەریەك لەو هێزانە بە هۆیەکی تایبەت ئەو بەرپرسیارێتییەی کەوتە ئەستۆ، بە تایبەتی هێزە سۆشیالستی و هێزە شیوعیەکان،لە سەرهەڵدان و دروستبوونیانەوە وەك حزب لە قۆناغە جیاوازەکاندا خاوەنی بیرووباوەڕێکی پێشکەوتوو بوون و دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و درووستبوونی دەوڵەتی سۆڤیەتی سوودیان لە یەکەم ئەزموونی سۆشیالستی لە مێژوودا وەرگرتبوو، بەڵام وێڕای ئەو هەموو دروشمە جوانانەی کە بەرزیان کردبۆوە و ئەو پرۆگرامە نوێیانەی دایانڕشتبوو و ئەو تیکۆشانە ئازایانەی کە دەستیان پێکردبوو بۆ گەیاندنی ئەو بیروباوەڕە بە جەماوەر لە شێوازی گونجاودا لە وولاتەکانیاندا،کەچی سەرنەکەوتن، هێزە شەعبیەکانیش کە ئەوانیش چەندین حزبیان پێکهێنابوو خاوەنی بیروباوەڕێکی زانستی نەبوون، شێوازێکی ڕۆمانسیانە باڵی بەسەر پرۆگرام ودرووشمەکانیاندا کێشابوو،لەگەڵ ئەوانەشدا هەموو ئەو هێزانە، شیوعییەکان و قەومییەکان لە تێکۆشانیاندا کەوتنە هەڵەی زۆر گەورەوە، دیارترین و بە هێزترین ئاکاری خراپی ئەو هەڵانە دابەش بوون وناکۆکی و پێکهەڵپژانی ناوخۆیی بوو لە ناو هەریەکەیان و لە نێوان خۆشیاندا، لەوانەش ترسناکتر لە قۆناغی یەکەمی دوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ڕوودانی هەڵگەڕانەوەی سەربازی (انقلاب عسکری) بوو، کە بە هۆیانەوە ڕژێمی سەرکووتکار دروست بوو، بۆ ماوەیەکی زۆریش لەم وولاتانەی ئێمەدا بوونە هۆی پەکخستنی پێشکەوتن، وێڕای ئەوەش داڕووخانی سیاسی و ئابووری وکۆمەڵایەتی و

ڕۆشنبیری،وێڕای شکانیی سەربازی، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی شێواندنی هۆشیاری خەڵکی و کردنیان بە کۆیلەی بێهیوایی و بیرکردنەوە لەوەی ئیتر توانای ڕزگاربوون نییە و کردنیان بە بەشبەشی جیاو کوێر و بێ هەست و بێ توانا، بە خواستی خۆیان یا بەزۆر پەلکێشکران بۆ خزمەتی ئەو بەرژەوەندیانە و ئەو ئامانجانەی کە زووربەیان دژی بەرژەوەندی و ئامانجی وولاتەکانی ئێمە و جەماوەرەکەی بوو .

ئێمە ئێستا سەرقاڵی بووژاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینەین کە لە باروودۆخێکی نوێدا وولاتەکانمانی تیا ئەژی، ئەو ڕاپەڕینەش بۆ ڕزگاربوونی وولاتەکانمانە لەو کۆسپانەی بەردەمی پێشکەوتن و ڕزگاریخوازی و گەشەکردن، تا بتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت لە دەستێوەردانی دەرەکی لە ئیشوکارەکانیدا، لە سەردەمێکدا کە تەماعکاریی سەرمایەداریی گلۆباڵ کە باڵی کێشاوە بەسەر جیهاندا بە هەموو شێوازێك تەنانەت هێرشی سەربازیش پیادە ئەکات لەو دەست تێوەردانەدا .

لەو ڕوونکردنەوەیەی پێشەوەدا، کە من دایئەنێم بە پێشەکییەکی ڕەخنەی بنیاتنەر، پێویست ئەکات پرسیارێك بکەین، کە ئەویش ئەوەیە : لەم سەردەمەی ئێمەدا هاووڵاتییەك خۆی ناو بنێت چەپ چی ئەگەیەنێت، چ مانایەك ئەبەخشێت؟ یەکەم ئەو پرسیارە پەیوەندی هەیە بە چۆنیەتی ئەو ئەرکانەی کە پێویستە وەك ئەرکی ئەو قۆناغە بێت کە ئێمەی تیا ئەژین چ وەك عەرەب و چ وەك جیهان، ئەو ئەرکانەی ئاڕاستەیە بۆ ڕوودانی گۆڕانێکی دیموکراتیانە، دووەمیش ئەو پرسیارە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە مەرجە نوێکانی دوای هەرەسی ئەزموونی سۆشیالستی لە لانکەی سەرهەڵدانیدا لە ڕووسیا، لەگەڵ ئەو کاریگەریانەی کە کردیە سەر هەموو ئەو بزوتنەوانەی کە لە ژێر ناوی سۆشیالستی و شیوعیەتدا بوو.

ئەم پرسیارە ئاسایی و مەنتقییە، وەڵامەکەشی دیاریکراو و بنبڕ نییە، لەبەر ئەوەی بەو وردییە ناتوانین مانای چەپ دیاری بکەین،بە تایبەتی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ناونانەکەی، کە ئەو سەردەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی شۆڕشی فەرەنسی، بەڵام ئەم ناوە لەو سەردەمەوە خوازراوە بۆ ڕێڕەوی ئەو تێکۆشەرانەی کە هەوڵی گۆڕان ئەدەن لە وولاتەکانیاندا بە ناوی سۆشیالستیەوە بە هەموو ڕوانگە جیاوازەکانیەوە، ئەم ناوە پەیوەندی بچرا بە مێژووەوە و بوو بە هی هەموو سەردەمێك، سەردەمی سەرهەڵدانی و کاتی ئێستاش، بۆیە ئەبینین کە چەپەکان هەوڵئەدەن خەسڵەتی تر بخەنە پاڵ ئەم ناوە، لە پێناوی دیاریکردنی ئەو چەپەی ئەمان لایەنگرین و چۆنیەتی چەپەکە و ڕێڕەوی و ئەرکەکانی، بەم جۆرە چەپی شیوعی هەیە بە گوێرەی ناونانە مێژوییەکەی و چەپی دیموکراتی هەیە و چەپی چاکسازی هەیە و میانڕەو و پاریزگار و چەپی سەرکێش و نەتەوەیی و چەپی بێ ناویش هەیە،وێڕای ئەو هەموو جیاوازی ناو و ناوەڕۆك و خەسڵەتانە، وشەی چەپ بۆتە هاوبەشییەك لە نێوان هەموو ئەوانەدا بە بێ جیاوازی، بە بڕوای من ئەم ناوناتۆرانە هەر بەردەوام بەکاردێت لە نێوان چەپەکاندا، زۆریش داکەوتوە لەم سەردەمەدا بە تایبەتی لە قۆناغی دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤێت و ئەزموونەکەی،کە ناوی سۆشیالستی هەڵگرتبوو، نموونەی ئەم ناوناتۆرانەش لە نێوان دوو لایەنی جیاوازدا بە کاردێت بۆ نموونە چەپە نوێکان بە چەپە کۆنەکان ئەڵێن کۆنەپارێز و چەپە کۆنەکانیش بە چەپە نوێکان ئەڵێن لە ڕێڕەوی چەپ دەرچوون و بە ڕێڕەوی لیبرالیەتدا ئەڕۆن و بەم جۆرە .

من ئەوەی مەبەستمە لەم لێکۆلینەوەیەدا دەربارەی پرۆژەی نوێی چەپ لە جیهانی عەرەبییدا، فراوانکردنی بازنەی چەپە،ئەو فراوانبونەی لە بنکەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ڕویداوە بۆ ئەو هێزانەی کە چەپ لایەنگریانە،

یاوەکتر بڵـێین کـە چـەپ داکـۆکی لـە بەرژەوەندیـەکانیان ئـەکات، هۆکـارە باشەکانی ئەم فراوانبوونە بە پێی خوێندنەوەی خۆم بـۆ ڕووداوە واقیعیـەکانی سەردەمەکە لەم وولاّتانەی خۆمانـدا و لـە جیهانـدا و ئـەو ئەرکانـەی بـەدی ئەکەم، لە ڕووانگەی ئەو ڕووداوانەوە چەند هۆکارێکە، یەکێك لـەو هۆکارانـە لە دواکەوتوویی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی باوەوە سەرچاوە ئەگرێ لـە وولاّتەکانماندا، کە ڕەگی لە کۆن و نوێشدا ئەگەڕێتـەوە بـۆ سـەرکووتکاری و، هۆکاری تریش بریتیە لە هۆکارە دەرەکی و ناوەکیەکان، ئـەو دواکەوتوییـە وا لە پرۆژەی گۆڕانکاری دیمـوکراتی ئـەکات ببێتـە پرۆژەیـەکی نیشـتمانی کـە مەبەستمان لەوەیە بۆتە ئاواتی زۆر لە توێژەکانی کۆمەڵ، هۆکاری دووەمـیش لە و جەمسەرگیریەدا هاتووە کە ئێرەش و هەموو جیهانیشی گرتۆتـەوە، کـە لە دایکبووی ڕژێمی سەرمایەداریی گلۆباڵە، کە وا لـەو وولاّتانـە ئـەکات کـە شێوازی تایبـەتی وەربگـرن و بنکـەی هێـزە زەرەرمەنـدەکان فـراوان بکـەن، ئەمەش وایکردوە کـە پرۆسـەی گـۆڕان لـە یـەك توێـژاڵ تێپـەڕێت و تـەنها پەیوەست نەبێت بە چینی کرێکارەوە، بەڵکو هەموو بوارەکانی تـری ئـابووری بگرێتەوە لە هەموو شێوازەکانی بەرهەمهێناندا چ لە شار و چ لە لادی .

کەواتە چـەپ ئـەکرێ کـارتێکراو بێـت بـە بیروبـاوەڕی سۆشیالسـتی،لە سەردەمی مارکسەوە تا ئێستاش، هەروەها ئەشێ ئەنـدام بێـت لـە حزبێکـی سۆشیالستی یا شیوعی یا حزبێکی نەتەوەیی نزیـك لـە سۆشیالسـتەوە، بـە مانایەکی فراوانتر ئەتوانێ دیموکراتییەك بێت، لەبەر ئەوە ئەو چەپەی کە ئـەم لێکۆلینەوەیەی پێشکەش ئەکەم ئەو جەماوەرە فراوانەیە کـە لـەم وولاّتانـەی خۆماندا چاویان لە گـۆڕانی کۆمەڵەوەیـە و ئەیانـەوێ سـەربەخۆیی وولاّت و پێشـکەوتن بەدەسـت بهێـنن، کـە بـە تێکۆشـان نـەبێت ئـەو گۆڕانکارییـە جەوهەرییە  لە ڕووی سیاسی و ئـابووری و کۆمەلاّیەتیـدا بەدەسـت نایـەت،

گرنگی پێشنیارکردنی ئەم پرۆژەیە بۆ چەپی جیهانی عەرەبی لەم بارودۆخەدا کە ئێمەی تیداین لەوەدا دەرئەکەوێت،

بەلاّم ئەوەی کە لە لای من گرنگە جەختی لەسەر بکەمەوە و بە هەلّە تێنەگەین ئەوەیە کە باش بزانین کە چەپ دەمراستی هەموو کۆمەلّ نین و براگەورەی هەمووان نین و هەرئەوان بەتەنیا لەسەر هەق نین و بەرنامەکانی ئەوان نوێنەرایەتی هەموو بەرنامەکانی ئەوانە تر ناکات کە لە هەولّی گۆڕیندان، بەلّکو لەسەر خەلّکی چەپ بە هەموو ڕەوتە جیاوازەکانیەوە پێویستە بەردەوام بەرنامەکانیان چاك بکەن و بە هەموو توانایان هەولّ بدەن کە قەناعەت بە جەماوەرەکەیان بکەن کە بۆ ئەوان و هەموو گەل  بە ئەمەك ئەبن لە پیادەکردنی سیاسەتدا و بەرەوشت ئەبن و ئەو بەرنامانە پێشکەش بکەن کە لە خزمەتی نیشتمان و خۆشگوزەرانی گەلدا ئەبێت، و دلّنیایان بکەن کە ئەمان هاوبەشی تێکۆشانن لە پێناوی گۆڕاندا، تەنانەت ئەگەر لە زۆر هەلّوێستی سیاسی و بیرو باوەریشدا لەگەلّیان یەکنەگرنەوە .

ئەو تێڕوانینەی پێشەوە هەرگیز ئەوە ڕەتناکاتەوە کە چەپە دێرینەکان کە پێکهاتوون لە حزب و جوولاّنەوە و کۆمەلّە سیاسیەکان و کۆمەلاّیەتیەکان وئابووریەکان و ڕۆشنبیریەکان بیانووی بوون و مانەوەیان لەدەستداوە، هەرچەندە کە تووشی تێکشکان و پاشەکشەش بوون لە هەلّوێستا، ئەوانە هێزێکن هەن، پێگەی خۆیان هەیە و ڕێڕەوی سیاسی خۆشیان هەیە و جەماوەری خۆشیان هەیە، کەواتە بێگومان بوونیشیان هەیە، هەرچەندە سیاسەتەکەشیان دوور بێت لە درووشمەکانیانەوە، گۆڕان و نوێبونەوە و خۆچاککردن لەم حزب و ڕێکخراو و بزووتنەوانەدا کەوتۆتە سەر شانی ئەو جەماوەرەی کە لە دوایەوە وەستاوە، ئەو گۆڕانەش کە هێزەکانی چەپ هەولّی بۆ ئەدات، کە خاوەنی بەرنامەیەکی واقیعی و نوێن و پەیوەستن بە سەردەم و

مەرجەکانیەوە، تەنها بە بانگەشەکردن بەدی نایـەت، تەنانـەت ئەگـەر ئـەو بەرنامانەش جەماوەرێکی زۆری لە دەور کۆبووبێتەوە، هێزەکانی چەپ ئـەبێ هەست بەوە بکەن ڕێگەی تێکۆشان لە پێناو گۆڕاندا دوروو درێژ و ناهـەموارە و پێویستی بە بلاّوکردنەوەی هۆشیارییە لە ڕیزەکانیا و پێویستی بـە ئـارامی و هەناسـە درێـژی هەیـە، هـەروەها پێویسـتی بـە بـەردەوامی تێکۆشـانی دیموکراسیانە هەیە، پێویستە بەدوور بن لە توندڕەوی و سەرکێشـی بەتایبـەت ئەوەی پێی ئەڵێن (توندووتیژی شۆڕشگێڕانە) لە ژێر درووشمی خێراتر گەیشـتن بە ئامانج، گرتنەبەری ڕێگەی سەرکێشـی ناگاتـە هـیچ ئـەنجامێك و ڕووداوە مێژوییەکان لە کۆن و نوێدا ئەوەیان سەلماندوە کە تەنها ماڵوێرانی و ڕووخانی ئەو ئامانجانەیە کە بەو ڕێگەیە هەوڵی بۆ ئەدەن، من بە شێوەیەکی بنەبڕ بـۆم دەرکەوتوە کە (توندوتیژی) بە هەموو شێوازەکانیەوە ناگونجێت بـۆ تێکۆشـان بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکان، بۆیە بە گرنگـی ئـەزانم کـە لەبەرانبـەر توندوتیژیـدا بوەسـتینەوە و ئـەوەش لەبەرچـاو بگـرین کـە ئـەو بزوتنـەوە شۆڕشگێڕییانەی بەو ڕێگایەدا ڕۆشتوون هیچ ئامانجێکیان بەدەست نـەهێناوە و لە ناویشیاندا ئەو شۆڕشانەی کە لەژێر ناوی سۆشیالستیشدا بوە هیچـی لێ بەدەستنەهاتووە، ئەنجامی دڵتەزێن و نەخوازراو نەبێت و بەڵگەش لـەو ڕووەوە زۆرە، ئـەزموونی دوروو درێـژی خـۆم لـە کـاری سیاسـیدا لـە ژێـر نـاوی سۆشیالسـتیدا و پەیوەنـدی زۆرم وسـەردانی زۆرم بـۆ هـەموو جیهـان و خویندنەوەی زۆرم و ئاگاداریم لـە زۆر سەرچـاوە، ئەمانـە هـەمووی ڕێگـەی ئەوەم پێئەدەن کە لەو ڕووەوە شایەتی بدەم لەسەر ئەوانەی کە ئەیلێم .

# دەرگای دووەم

## کۆڵەکە سەرەکییەکانی پڕۆژەی گۆڕان بە ناوی چەپەوە

گۆڕان تەنها دروشمێك نیە ئەوانەی مەبەستیانە گـۆڕان دروست ببێـت بـەرزی بکەنـەوە لـە پێنـاوی گـۆڕینی وولاّتـەکانیان بـەرەو سەربەسـتی و پێشکەوتن و دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بەڵکو پرۆسەیەکە مەرجی تایبـەتی خۆی هەیە و ئەگەر مەرجەکان پشتگوێ خران ئەوا ئەو گۆڕانکاریە بەدەست نایەت، ئەومەرجانەش تێکەڵاوکردنی کۆنە بە تـازە وردە وردە تـا شـێوازی ئاسایی خۆی وەرئەگرێت و هاووتا ئەبێت لەگەڵ ڕووداوەکانی گۆڕینـدا، لـە ڕوانگەی ئێستاوە تا بە ڕوونی دەرئەکەوێت و بە سودوەرگرتن لە ئەزموون و ئەو ڕوداوانەی کە گـەلانی تـر پیاڕۆیشـتوون و ئارەزوومەنـدی گۆڕانکـاری بوون، پێویستە لەسەر خوازیارانی گۆڕان و ئەوانەی کە خۆیـان بـە خـاوەنی ئەو پڕۆژەیە ئەزانن سوود لە لایەنە باشـەکانی ئـەو ئـەزموون و ڕووداوانـە وەربگرن و خراپەکانی بخەنە لاوە،هـەروەها پێویسـتە لەسـەریان کـە پـێش دەستکردن بە گۆڕین پشت بەو بناغە گرنگانـە ببەسـتن کـە لـە گەوهـەری مەرجەکانی گۆڕانە تا گۆڕان ڕێڕەوی ڕاستی خۆی بگرێت بەرەو سەرکەوتن .

ئەو بناغە گرنگانە چین ؟

پێدەچێت من لە پێشکەشکردنی ئەو بناغانەدا هەنـدێك بابـەتی بەڵگـە نەویست دووپات بکەمەوە،کە باوەڕمان پێهێناوە بەلاّم واقیعی ئێسـتامان وایلێهاتوە یا وا ئەخوازێت کە زۆرجار تێبکۆشـین و هەوڵبـدەین بـۆ ئـەوەی

ئەوە بسەلمێنین، کە بەڕاستی ئەوبەڵگە نەویستە پێویستی بە سەلماندن نیە و پێویستی بەوە نیە ئەو تەموو مژەی کە گومانە لەدەوری بکەینەوە.

ئەو بناغانە ڕیزبەند ئەکەم بێئەوەی بکەومە لێکدانەوە و باسکردن و لێکۆلینەوە دەربارەیان

یەکەم / دەستپێکردنی دیاریکردنی بناغەی پڕۆژەیەکی نوێیە بۆ چەپ لە جیهانی عەرەبیدا، لەم قۆناغەی مێژووی ئێمەو مێژووی جیهاندا، گەڕاندنەوەی شکۆمەندییە بۆ سیاسەت، بە مانا ڕۆشنبیری و زانستی و ئابووری وکۆمەلاٚیەتیەکەی، بە پشتبەستن بە ڕەوشت، لیرەدا کە ئاماژە بە ڕەوشت ئەکەم مەبەستم ڕزگارکردنی سیاسەت و کاری سیاسیە، بە تایبەتی لای کەسانی چەپ، لەو بەلاٚیانەی لە وولاٚتانی ئێمەدا بە ناوی سیاسەتەوە ناو ئەبرێت، وەکوو دووڕویی و هەڵخەلەتاندن و گەندەڵی و ساختەکاری و جوولاٚندنی هەوەس،کە ئەمانە هەمووی بە ناوی سیاسەتەوە ئەکرێت ولای خەڵکیش وا ڕەنگی داوەتەوە کە سیاسەت بە مانای ئەو شتانە، مەرجی سەرەکی پیادەکردنی سیاسەت بە ناوەڕۆکە ڕۆشنبیری و زانستی وئابووری و کۆمەلاٚیەتییەکەی ئەوەیە کە ڕۆشنبیری فرەیی بوون و فرەیی جۆر هەبێت،مافێکی ڕەوای تاك و کۆمەڵ بێت لە گوزارشتکردن لە بیرو بۆچونیان، هەرچەندە جیاوازبن لە هەلۆیست ولە بیروباوەڕی سیاسی و کۆمەلایەتیدا، مەبەستم ئەوەیە هەموو کەس و کۆمەلێك سەربەست بێت لە دەربڕیندا و کەسێکی تر یا کۆمەلێکی تر مافی ئەوەیان نەبێت لەبەر جیاوازی بیروڕا یا ڕەگەز یا ڕەچەڵەك ڕێگەیان لێبگیرێت،بە پێچەوانەی ئەوەوە کە سەردەمانێکی زۆرە ئەوە لای ئێمە باوە کە ماف تەنها بۆ کۆمەلێکی سیاسییەو مافی ئینکاریکردنی ڕاستیشی بەخۆی داوە، هەروەها مافی ئەوەشیان بەخۆیان داوە کە بەرانبەرەکانیان کە ناکۆکن

لەگەڵیاندا لە هەڵوێست و بیرکردنەوەدا تاوانباریان بکەن، هەروەك چۆن لای ئایندارەکان (مەبەستی ئەوانەی بە ناوی ئاینەوە قسە ئەکەن وەك حزبە ئیسلامیەکان — وەرگێڕ)بەرانبەرەکانیان بە کافر ئەزانن وهەمان شێوەش سۆشیالستەکان نەیارەکانیان بە لادەر و هەڵگەراوە لەقەڵەم ئەدەن، ئەم جۆرانە بەرانبەرەکانیان سەرکووت ئەکەن یا بەدەرکردن و دوورخستنەوە یا بە کوشتن و پاکتاوی جەستەیی، ڕزگاربوون لەم جۆرە هەڵسووکەوتە و ئەم نموونانەی کە قۆرخی هەموو شت ئەکەن و هەرخۆیان بە ڕاست ئەزانن و مافی بەرانبەرەکانیان زەوت ئەکەن، ڕزگار بوونی تاك و کۆمەڵە و ڕزگاربوونی سیاسەتە لە توندڕەوی و ڕەگەزپەرستی و تایەفەگەریتی و ئاینی، ئەگەر ئەم بناغە پتەوە دیموکراتیە بۆ پرۆسەی سیاسی پیادە کرا ئەوا پیادەکردنی سیاسەت لە لایەن حزب و ڕێکخراوەکان و بزوتنەوەکان و کۆمەڵە سیاسییەکانەوە و دامەزراوەکانی کۆمەڵەی مەدەنییەوە بە هەموو جۆرەکانەوە بەرەو گیرانی ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆیان ئەڕۆن ، لە پیادەکردنی دیموکاتییەتدا و ئەکەونە کێبرکێوە لە هەموو بوارەکاندا بۆ بەدەستهێنانی پرۆژەی گەورە بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە، ئەو کێبرکێیەش دیموکراتیانە ئەبێت و هەندێك یاسا ڕێکیان ئەخات کە لە لایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتی ئەکرێت و لە لایەن حکومەتیشەوە ئەو یاسایانە دائەڕێژدریت کە لە پێناوی دادپەروەری و یەکسانیدا داڕێژراون، هەر بەم یاسایانە دیموکراتییەتی ڕاستەقینە دێتە ئاراوە، مەرجی ئەم دیموکراتیەتەش دەستەبەرکردنی مافەکانە بۆ هەموو کۆمەڵ، پێویستە ئەو دامودەسگایانەش کە ڕاسپێردراون بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە پاك و دادپەروەربن، هەروەها سەربەخۆ کاربکەن بەرانبەر هێزە کۆمەلایەتییەکان و سیاسیەکان و لەژێر کاریگەری هیچ کەس و لایەنێکدا نەبن، چاوی چاودێری کۆمەڵ و

دەسگاکانی چاودێریان لەسەربێت لە ڕێگەی دامەزراوە دیموکراتییەکانەوە، هەموو ئەم خەسڵەتانەی دەوڵەت و دامەزراوەکانی و یاساکانی و ئەرکەکانی بەم شێوە دیموکراتیە لەخۆیەوە نایەتە ئاراوە، بەڵکو پێویستی بە تێکۆشان و هەوڵدانە لە پێناو بەدیهێنان و بەرەو باشکردنی بە بەردەوامی، مەرجی سەرەکی حزبەکان و ڕێکخراوەکان و بزووتنەوەکان وکۆمەڵە سیاسیەکانیش ئەوەیە لە ئیشوکاریاندا پەیوەست بن بە دیموکراتیەتەوە و بە مانا ڕاستەکەی دیموکراتیەت و ناوەڕۆکی دیموکراتیەتێکی سەردەمیانە، ئەوانە هەموو ئاماژەن بۆ وازهێنان لە بەربلاوی لە بیروباوەڕ وسیاسەتدا وڕێزی پرۆگرامی ناوخۆی خۆیان بگرن، مافی گوزارشت و بیروباوەڕ و هەڵوێست وەرگرتن و بڕیاردان بە خەڵکی بدەن،بە پێچەوانەی سەردەمەکانی پێشوو یان سەردەمی ئێستای هەندێك لە حزبە سیاسیەکان کە تائیستاش وا مامەڵەی حزبە چەپەکان و حزبە ڕاسترەوەکان و وحزبە ئاینیەکان وسەندیکاکان و دەسگا ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیەکان ئەکەن، کەوەك هەموویان تەختەو دار بن و کۆمەڵێك سەرکردە و سەرۆك حوکمیان ئەکەن وەك ئامێر مامەڵەیان ئەکەن، بە دڵرەقانە و نەیارانە لێیان ئەڕوانن، چ ئەوانەی لە دەسگاکانی دەوڵەتان و چ ئەو کۆمەڵ ودامەزراوە سیاسییانەش تێکرا بەو جۆرە پشتگوێخراون، ئەو کۆمەڵە خەڵکانەش بەرانبەر ئەو سەرۆك و سەرکردانە هەموو هەستێکی ڕەخنەگرانەیان لا ون ئەبێت وئاگایان لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان نامێنێت چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ، بەڵام کێبرکێی پرۆژە سیاسیەکان مافی ئەوە ئەدات بە هەموو ئەو حزب و ڕێکخراو و بزوتنەوانە کە هەوڵی گەشتنە دەسەڵات بدەن بە شێوەیەکی دیموکراتیانە، کە پێویستە ئەو کێبرکێیە بەردەوام بە شێوەیەکی دیموکراتیانە هەبێت و کێبرکێی دیموکراتیانەش بۆخۆی توندوتیژی ڕەت

ئەکاتەوە، لە بەر ڕۆشنایی ئەو هەموو روداوو ئەزمونەدا لە مێژووی کۆن و نوێدا ، کە وولاٙتانی ئێمە و جیهان بە خۆیەوە بینیوە، ئەبێت هەموو حزبەکان بە هەموو ڕەوتە جیاوازەکانەوە چ چەپ و چ ڕاست هەست بەوە بکەن، کە کاتی ئەوە هاتوە بڕیاری ئەوە بدەن کە لەتوندو تیژی دوور بکەونەوە و ئەوە بزانن توندو تیژی هیچی لێ بەرهەم نایەت مالۆیرانی و ولاٙت وێرانی نەبێت ، تەنانەت ئەو توندوتیژیانەش کە بە ناوی تێکۆشان لە پێناوی سەربەستی و دادپەروەری و یەکسانییەوە کراوە، هەر بۆتە هۆی سەرەونخونکردن و لە دەستدانی ئەو ئامانجانەی کە هەوڵیان بۆ داوە، نمونەش زۆرە و هەموو ئەو شۆڕشانەی لە ماوەی کۆن و نوێدا کراوە بەو جۆرە گەواهی ئەوە ئەدەن، لە بری توندوتیژی ڕێگەی دیموکراتی هەمەجۆر هەیە بۆ تێکۆشان لە پێناوی گۆڕاندا، ئەوانەش کە ئەڵێن تێکۆشان بۆ مافێکی سیاسی یا کۆمەلاٙیەتی یا نیشتمانی بۆ هەموو کۆمەڵە و لە پێناوی مەسەلەیەکی ستراتیژی گەورەدایە و لە هەمو بارودۆخێکا یەك شێوازی هەیە ئەوانە ڕاستیەکان ئاوەژو ئەکەن، مێژوو بۆمان ئەسەلمێنێت کە هەر قۆناغەو مەرجی خۆی هەیە بە پێی ئەو ئامانجانەی کە دیاری ئەکرێت و بە پێی شێوازی ئەو تێکۆشانە، هەر تیپەڕاندن و لادانێك لەو مەرجانە خاوەنەکەی ئەخاتە خانەی سەرکێشی کردن و بە فیڕۆدانی پاشەڕۆژی گەل و ولاٙت، جیاوازی و هەمەجۆری شێوەکانی تێکۆشان کارێکی ئاساییە ، تەنانەت جیاوازیش لە شێوەکانی تیکۆشان دژ بە بەرهەڵستی و بەرەنگاربونەوەی وولاٙتێکی داگیرکەر پێویستی بە وردی هەیە لە هەڵبژاردنی ئامڕازەکانی بەرەنگاربوونەوە و هەڵبژاردنی ئەو مەرجانەی کە بۆ ئەو شێوازە تێکۆشانە پێویستە و لەگەڵ هەڵبژاردنی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو مەرج و ئامرازانە، زۆرجار بە مانای دیموکراتیەتێکی

ئاشتیانە، دیموکراتیەتی سیاسی کە دیبلۆماسیەتی پیِّ ئـەوترێت، تەنانـەت ئەگەر چەکیشی تیا بەکار هات پێویستی بەوە هەیە کە بیر لەوە بکرێتـەوە چـۆن بـەکار بێـت، تـا بـەکارهێنانی ئـەو چـەکە دژی مەبەسـت بەرهـەم نەهێنیت، هەروەکو لینین ئەڵێت ئەوە بۆخۆی هونەرێکە یاساو مەرجی خۆی هەیە لە هەموو بارودۆخێکدا، لەبەر ئەوەی سەربەستی مرۆڤ و مافەکانی و بەختەوەری ئامانجی سەرەکییە جا ئەگەر ئەوە لەدەست چوو ئـەوا هیچمان نـەکرد، بۆیـە هەلبـژاردنی شـیوازەکانی تێکۆشـان مەبەسـتە چ لـە ڕووی سیاسییەوە و چ لە ڕوی سەربازییەوە، کە پێویسـتە پارێزگـاری لـە ژیـانی مرۆڤ مەبەستێکی گرنگ بێت، زیادەڕۆیی نەکەین لـە لەدەسـتدانی ژیـانی مرۆڤدا لە ژێر ئەو جۆرە دروشمە وروژێنەرانـەدا، لـە بـری سەرکێشـی کـە هـەردەم تونـدو تیـژی لێئەکەوێتـەوە ، پێویسـتە ڕێـز لـە دوو مەسـەلەی سـەرەکی بگـرین : یەکـەم ڕێـز لـە تێکۆشـانی قۆناغکـاری بگـرین لـە هەوڵدانماندا بـۆ گـۆڕان، دووەمـیش خۆمـان ڕزگارکـەین لـە کـورتبینی و تایەفەگەری و ئاژاوە لە کاری سیاسیدا، ئەگـەر قۆناغکـاری پێویسـتی بـە مەرجی تایبـەت بـە سـەردەمەکە هەیـە و پێویسـتە بـۆ گـۆڕان و ئەگـەر گۆڕانکاریەکان قۆناغ دوای قۆناغ دێت و تێکۆشانی هەر قۆناغێـك کەڵکـە بووی تێکۆشانی قۆناغەکانی پێشتریشـی تیایـە ئـەوا ڕزگـار بـوونیش لـە ڕەگەز پەرەستێتی و هەلپەرستی سیاسی بە مانای خۆڕزگارکردن لە کەوتنـە ژێر کاریگەری درووشمـی دیماگۆگی دێـت کـە خاوەنـەکانی ئـەو دروشمانـە هەرئەوەندەیان بەسە بەرزی بکەنەوە بێئەوەی بیریان لـەوە کردبێتـەوە چـۆن ئەگـەن بـە بـەدیهینانی ئـەو درووشمانـە، واتـە مەرجـە واقیعیـەکانی بەدەستهێنانیان دەستەبەر نەکردووە، یا وەك ئەوەی کە مەبەسـتیان نـەبێت چۆن دەستەبەری بەدیهێنانی ئەکەن، بە قەدەر ئەوەی مەبەستیان وروژانـدنی

هەست وسۆزی خەڵکیە،و بەمەش گەل بەرەو ئـاژاوە و سەرکێشـی ئەبـەن و ئەنجامیش نرخێکی گران ئەکەوێت لە سەریان، ئاژاوە گێڕی و گێرە شـێوێنی هەروەك هەلبازی و شۆڤینی وایە و ناگەنە بەدیهینانی ئامانجەکانی گـۆڕین، بە ڵکو هەر هەوڵی بەرهەڵستی ونارِەزایی ئەدەن بەرانبەر ئەو واقیعـەی کـە پێویستی بـە گۆڕانـە، بـێ ئـەوەی پرۆژەیـەکی بـەجێ پێشـکەش بکـەن و پرۆگرامی ئەو گۆڕانەی لەخۆ گرتبێت، یا بێ ئەوەی هەوڵ بـدەن شـێوازێکی ڕاستەقینە بدۆزنەوە بۆ گۆڕان، ئەم نابینایی و نابەرچاو ڕوونییەش بێگومان ئەنجامەکەی شکست و ڕووخاندنی خۆ و ئەوانی تریشە.

ئەم ڕاستییە رونانە کە ئامـاژەم پێکـردوون، وەك بناغەیـەکی سـەرەکی وایە بۆ هەر پرۆژەیەکی گۆڕان، بـە شـێوەیەکی تایبـەتی ئـەمڕۆ و هـەموو کاتێکیش ئـەبێ پێـداگری بکرێـت لەسـەر مافـەکان و بـەهاکانی مـرۆڤ و ڕێزگرتنی و بەهای پێشکەوتن و دادپەروەری و یەکسانی، بە تایبـە تـی لـە وڵاتانی ئێمەدا کە ڕژێمـە سـەرکوتکەرەکان دەسـتیان بەسـەرا گرتـووە بـە هەموو شێوەیەك و هەر ئەو ڕاستیانەشە کە تێگەشتن لە هاونیشتمانی بوون و مـاف و داد دڵنیـا ئەکاتەوە،هەرئـەم مەرجانەشـە کـە ئەبنـە کۆڵەکـەی پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ، ئەم ڕاستیە بەڵگـە نەویسـتانەش لـە ئێسـتاو داهاتووشـدا ئەبنـە شـوێنی گرنگیپێـدانی زانسـت و ڕۆشـنبیری و ئەبنـە مەڵبەندی بلاوکردنەوەی هەستیاری و ڕۆشنبیری لای خەڵکان بە جۆرێك کـە زانیاریان هەبێت دەربارەی مافە سرووشتی و ئاساییەکانیان لـە نیشـتماندا، و بەر لە بیروباوەڕی ڕەگەزپەرستیانە و جیاخوازیانە بگرێت و ڕێگـەش لـەو بیروباوەڕانە بگرێت کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەو دواوە ئەبات و ئەیکاتە کۆیلەی دواکەوتوویی و نەبوونی توانـا ودەسـەڵاتی بـەڕێوەبردن و ئامـادەی ئەکات بۆ کوێرەوەری و باوەڕبوون بە جادو شوێنکەوتنی وەهم و بێهودەیی.

ئەم پێگە سەرەکی و گرنگانـە بـە گشـتی مەرجـە پێویسـتەکانی هـەر پرۆژەیەکی ڕاستەقینەی گۆڕان پێکئەهێنن،بەلاّم پرۆژەی گۆڕان لـە وڵاّتـانی ئێمەدا لەسەردەستی چـەپەکاندا بـە هاوکـاری هێـزە دیموکراتیخوازەکـان و پاڵپشتیان کە لە هەموو ناوەندەکانی کۆمەڵگاوە هاتوون، وێڕای ئەو پێگـە سەرەکیانە تا هەموو توخمە پێویستەکانی گۆڕان تەواو ئـەبێت، وا پێویسـت ئەکات لەسەر ئەو چەپانەی کە بەرنامەڕێژی ئەو تێکۆشـانە ئەکـەن تـا بـێ کۆسپ سەربکەون پێویستە دوومەرجی سەرەکی لەبەرچاوبگرن کە ئـەویش: یەکەم ئەبێ باوەڕیان بەوە هەبێت کە تێگەشتنە گشـتیەکان لـە بیروبـاوەڕی سیاسی و کۆمەلاّیەتی قابیلی گۆڕانەو،بە گشتی لە بیروباوەڕیشدا هەنـدێك شت قابیلی گۆرانەو جێگیر نییە، بە شێوەیەکی ڕونتر بڵێین هـەر سـەردەم و زەمانەو تێگەیشتنی خۆی ئەخوازێت،مەرجە مێژووییەکانی ئـەو سـەردەمە ئامادەکاری ئەکات بۆ هەڵیەنجان و پێکهینانی ئەو بیروباوەڕ و سیاسەتە، بە واتایەکی تر بیروبـاوەڕ، هـەر بیروباوەڕیـك ڕوداوێکـی مێژوویـیـە، لەمـەدا جیاوازی نییە لە نێـوان بیروبـاوەڕی مارکسـی و لیبراڵـی و ئاینیـدا، دووەم بریتیە لەوەی هەر گۆڕانکارییەك لـە کۆمـەڵگای عـەرەبی ئێمـەدا و هـەر کۆمەڵگایەکی سەردەمدا بەگشتی کە ڕووئەدات، پێویستە زۆر بەوردی لێی بکۆڵینەوە و ڕەچاوی فراوانبونی ئەو بنکەو پێگە کۆمەلاّیەتییە بکـەین کـە بوونەتە هۆی ئەو گۆڕانە، کە بەردەوام لە فراوانبونـدایـە و ناوەنـدی تریشـی لەگەڵدایە، ئەمەش وائەخوازێت لە خەڵکانی چەپ  کە ڕزگاریان ببێت لـەو بیرکردنەوەیەی کە گۆڕان تەنها بە ئەرکی چینێکی تایبەت ئەزانێت، کە بـە تایبەت چینی کرێکار بێت، ئەم چینەش بۆخۆی گۆڕانکاری بەسەردا هـاتوە و، شـێوازەکانی بەرهـەمهێنان گـۆڕاوە و جەماوەرەکەشـی گـۆڕاوە و سروشتیشیان گۆڕاوە و ئەرکە کۆنەکەشیان وەك خۆی نـەماوە کـە مـارکس

پرۆژەکەی خۆی لەسەر بنیات نابوو، (چینی کرێکار ئەگەر بەو تێگەیشتنە کۆنە بێت کە پرۆلیتاریا بریتییە لەوەی کە لە کارگە بەرهەمهێنەرە گەورەکاندا کار ئەکەن و بە پێی لێکدانەوەی ئابووری مارکسی هێزی بازووی ئەوان قازانج درووست ئەکات و بە پێی ئابووری سەرمایەدارییش سەرمایە قازانج درووست ئەکات و ئەچێتە گیرفانی سەرمایەدارەوە، ئەگەر بەو تێگەیشتنە بێت ئەوا زۆر وولاَت هەیە وێڕای ئەوانەی کە هەژارن و ئەچەوسێنەوە زۆرن بەلاَم کارگەی تیانییەو ئەگەر بەو پێیە بێت ئەوانە پرۆلیتاریایان نیەو یا چینی کرێکاریان نیە، لێکدانەوەی تازە ئەوەیە سەرمایەدارو بازرگانی گەورە لە جیهاندا هەن وەك بازرگانی مولْك وتاوەرە گەورەکانی نیشتەجێبون و زۆر کاری گەورەی کە سەرمایەی گەورەی تیا بەکار دێت و خەلْکانێکی زۆری تیا ئەچەوسێتەوە، مەبەستی نووسەر لەوەیە کە ئەلْی تێگەیشتن لە چینی کرێکار گۆڕاوە — وەرگێڕ) بەلاَم ئەم چینە کرێکارە بەو شێوازە جیایانەوە کە بەخۆیەوە بینیویەتی ڕۆلْی ڕاستەقینەی خۆی هەیە لە گۆڕاندا، بەلاَم ڕۆلْێك جیاواز لەوەی کە سۆشیالستی مارکسی لە سەردەمی یەکەم ئەزموونیدا لە مێژوودا دیاریکردبوو ، هەروەها ڕۆلْێك جیاواز لەوەش کە لینین دیاریکردبوو، ئەم چینە زۆری تری پێوە لکاوە لەو هێزانەی کە نزیکن لێوەی، هێزێك کە بە پێی مێژوو ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوندایە لە ژمارە و لە قەوارەشدا کە هەموویان ڕۆلیان هەیە لە گۆڕاندا، ئەمانەش ئەو هێزانەن کە دڕندایەتی سەرمایەداریی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پالْیان پێوە ئەنێ بۆ ئەوەی بێنە گۆڕەپانەکەی گۆڕانەوە و تێبکۆشن لە پێناوی گۆڕاندا، ئەو دڕندایەتییەی کە سەرمایەداری گلۆبالًّ بەردەوام لە چەوساندنەوەدا هەولْ ئەدات و خەلْکی زیاتر ئەکاتە کەرەسەی بەرژەوەندیەکانی، خۆی بە شێوەیەکی

هەرێمایەتی و جیهانیش پەرە ئەسێنی و تا ئەگاتە ئەوەی چینەکانی ناوەراستیش ڕووت ئەکاتەوە و بەرەو هەژارییان ئەبات، درندایەتییەك کە سەرمایەداریی گلۆباڵ دەست ئەکێشێتە ناوەندەکانی ڕۆشنبیری و ئەوانیش ئەکاتە پێخۆری مەبەستەکانی خۆی .

بەلاّم کارێکی گرنگ هەیە کە دائەنرێت بە بەشێك لەو کۆڵەکانەی کە بە شێوەیەکی بەردەوام بنجبەست لێی تێبگەین ئەویش ئەوەیە کە لە ولاّتانی ئێمەدا و لە بەشێك لە ولاّتانی جیهاندا گۆڕان هەیە و گۆڕانکاری گەورەیان بەسەردا دێت کە پێویستە ئێمەش دژی نەوەستینەوە و لە شێوازە باشەکەیدا لەگەڵیا بین،ئەوەندەی کە بەرژەوەندی وولاّتەکەمان و مرۆڤەکانی تیا بێت .

ئەمە ئەو کۆڵەکانە بوون لە ڕوی دیاریکردنەوە لە لای من و بە شێوەیەکی تیوریانە کە ئەبنە بناغەکانی پرۆژەی گۆڕانێکی ڕاستەقینە، هەروەها ئەو بناغانەن کە پێشنیازم کردوون بۆ پرۆژەی چەپی نوێ لە جیهانی عەرەبیدا، بە تایبەتی لەم سەردەمەی ئێستادا، مەبەستم چەپی نوێیە، کە بە ڕووی دیموکراتیەتدا کراوەبێت بە هەموو ڕەوتەکانیەوە، ئەم کۆڵەکانەش لەگەڵ گرنگیشیاندا لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە بەستراونەتەوە بە سەردەم وتوانای جێبەجێکردنیەوە،هەروەها وەك هەر بیروباوەڕێکیش ڕێژەییەو ڕەها نیە و لە کاتی پێش جێبەجێکردنی و بەدەستهێنانی مەرجەکانی وەك خەیاڵ وایە،بەلاّم لە ڕوانگەی خۆمەوە و لە ڕووی تیورییەوە بە بناغەی سەرەکی دائەنێم بۆ چەپەکان .

# دەرگای سێیەم

## ئەرك و بابەتە ڕاستەوخۆكانی بەرنامەی گۆڕان بە ناوی چەپەوە

كاتێك باس لە پـرۆژەی گۆڕانكارییـەكی دیموكراتیانـە ئەكـەم بـە نـاوی چەپەوە، ئەوە نییە كە من داهێنانێكی نوێم كردبێـت لـە پـرۆژەی چـەپداو پێش من چەپ پرۆژەی نەبووبێت، بەڵكو ئەمە پرۆژەیەكی نـوێی جیـاوازە، لە ڕاستیدا هەوڵێكە كە سۆشیالستیەكی وەك من قالبوو، ئێستـا بێلایـەن ئەیـدات بـە پشتبەستـن بـە ئـەزموونێكی مێـژوویی لـە بـواری چـەپدا و خوێندنەوەم بۆ واقیعی ئێستای جیهان و عـەرەب، هـەرووەها هەوڵێكـە بـۆ هاوكاریكردنی ئەوانەی پێش من و دوای من هـەوڵی دیـاریكردنی ڕێـڕەوی چەپ ئەدەن، دوای ئەوەی تووشی هەڵوەشـاندنەوە و پەرتـەوازە بـوون بـو و پاشەكشەی كرد لە ڕۆڵی خۆی، هەروەها تەواوكردنی ئەو پرۆژانەیە كـە لـە هەلو مەرجێكی نوێدا بە ئەنجام نەگەیشتوون و پەرتـەوازەبوون، ئاساییشـە گەر ئێستا جیاوازی هەبێت لە مەرجە ئابووری و سیاسیەكانی ڕابردودا، بـە هۆی ئەو گۆڕانكاری و گەشەسـەندنانەوە كـە بەسـەر جیهـان و ناوچـەكەدا هاتوە لەم مـاوەی رابـردوەدا، ئـەو مەرجـە نوێیانـەی واقیعـی سیاسـی و ئابووری گۆرانكاری بەسەر بـارودۆخی كۆمەڵایەتیـدا هێنـاوە، كـە نـاكرێ پشتگوێی بخەین و ڕەچاوی نەكەین، كاتێك كە باس لە گۆڕان ئەكەین، ئـەو مەرجانەش كە كاریگەری هـەبوە لەسـەر چـەندی و چـۆنی بـێ هاوتـا لـە

کۆمەڵە سیاسی و کۆمەلایەتیەکاندا کە هێزی گۆڕانکاری دیموکراتیان لێ پێکدێت، ئەو مەرجانەش پاشەکشەی ڕۆڵی چینی کرێکاری تیا دروست ئەبێت ، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕۆڵەدا کە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا هەیەتی ئەو پاشەکشەیەش لە ڕۆڵی ئەواندا لە بەرهەمهێناندا ڕوی داوە بەهۆی ڕۆڵی ئامێرەوە، بە پێی گەشەسەندنی تەکنەلۆژیا کە شوێنی کرێکاری گرتۆتەوە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا، بەلاّم کۆی ئەم گۆڕانکاریانە لەم مەرجە نوێیانەدا لە ڕووی بابەتیەوە ڕۆڵی هیچ هێزێکی کۆمەلاّیەتی ڕەت نەکردۆتەوە لەو هێزانەی کە سەراپای جیهانی گرتۆتەوە کە ئەوانیش هەژارانن، ئەوانەن کە ئەچەوسێنەوە و پەراوێز خراون و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبوندان و تا سەرمایە نابەرانبەر بێت لای بەشێکی کەم کەڵەکە ئەبێت و بەشەکەی تریش ژمارەیان زیاد ئەکات .

لەبەر ئەوەی ولاّتانی ئێمە تا ئێستاش ژێردەستەی ڕژێمە سەرکوتکارەکانە، بە شێوازی جۆراو جۆر ناوەندی بڕیار قۆرخکراوە بۆ ئەوان، بە شێوازی جۆراو جۆر فەرمانڕەوایی کۆمەلگاو ولاّت ئەکەن، لەبەر ئەوە ئەو پرۆژە نوێیەی کە پێشنیازی ئەکەم هەرچەندە کەم و کورت و ناتەواو و ناکامڵ بێت ئەتوانم بڵێم پرۆژەیەکی تازەیە و زیاتر یەتەوە لەگەڵ مەرجەکانی سەردەمی نوێدا .

ئەو پرۆژە نوێیە چییە بۆ چەپ، لەم مەرجە مێژووییە نوێیەدا، هەروەها ئەو بابەتە بنەڕەتیانە چییە کە پێویستە ببنە بەرنامە، یا ڕەنگە ببن و ئەرکە هەستپێکراوەکانی چیە کە پەیوەندی هەیە بەو بابەتەوە بە پێی لێکدانەوەی من ؟

من هەندێك بابەت پێشنیار ئەکەم وەك تەوەرێك پێکدێت لە بەرنامەی تازە و کۆنی چەپ، وەك پرۆگرامێکی هاوبەش لە نێوان پێکهاتە

جیاوازەکانی چەپ لە هەر وڵاتێکی عەرەبیدا، وێـڕای ئـەوانیش هێزەکـانی تریش سەر بە هەر بنچینەیەك بن، کە یەك ئەگرن یا هەوڵ ئەدەن یـەکبگرن لە نێوان خۆیاندا بە گوێرەی بەرژەوەندییان بۆ گۆڕانکاری لە وڵاتەکانیانـدا، بـەڵام لـە پرۆسـەی پیادەکردنـدا هـەر وڵاتـەو بـە گـوێرەی تایبەتمەنـدی و بارودۆخی وڵاتەکە و هێزە ناوخۆییەکانی خۆی جیاوازی ئەبێت لە وڵاتێکـی تر، کە ئەمە ئاساییەو کێشـەمان لەسـەری نییـە، بـەڵام ئـەوەی کـە تیـا هاوبەشن لەو ئەرکانەی کـە دێتـە ڕێـی پێکهاتـە جیاوازەکـانی چـەپ لـە جیهانی عەرەبیدا، ئەوەیە کە وڵاتـانی ئێمـە بـە بـێ جیـاوازی هـەموویان واقیعێکی سیاسی گشتی ئاڵۆزیان هەیە لە ڕوی پێکهاتەییەوە کە تائێستـا چاوەڕوانی چارەسەرە، کێشەو دەردە سەرییەکی قوڵ و ئاڵوز، تا ئێستا ئـەو هێزانەی ڕێگایان گرتۆتە بەر بۆ چارەسەری نەگەیشتونەتە ئەنجام، ئایا چەپی نوێ بۆی چارەسەر ئەکرێت ؟ کە ئێمە وای دائـەنێین ڕێگایـەك بکاتـەوە بـۆ چارەسەری کێشە ئاڵۆزەکان، ئەرکی سەرەکی پێش دانانی بەرنامەیـەك بـۆ چەپی نوێ پێویست بەوە ئەکات کە تیشـکێك بخرێتـە سـەر بـاری ئێسـتا، لەگەڵ وروژاندنی لێکۆڵینەوە دەربارەی خوولقاندنی هۆشیارییەکی نـوێ کـە دەستەبەری هەڵسانەوەیەکی نوێی چەپ بکات لە جیهانی عەرەبیدا .

دۆزی یەکەم : بابەتێکی پەیوەندیدارە بە بنیاتنـانی دەوڵەتـەوە، کـاتی ئەوە هاتوە وڵاتەکانمان ڕزگاریان ببێت لە شـێوازی سـەرکوتکاری کـۆن لـە لایەن فەرمانڕەوا باڵا دەستەکانەوە، بە هـەموو جۆرەکانیـەوە، جێگـرەوەی ئەم دەوڵەتە کۆنانەش دامەزراندنی دەوڵەتی نـوێی دیموکراتیـە، کـە ئەمـە دەوڵەتی ماف و یاساو هاونیشتمانییە، دەوڵەتی دامەزراوە دیموکراتیەکانـە، هـەروەکو ئاشـکرایە لـە مێـژووی وڵاتـە نوێکانـدا تەنانـەت ئەگـەر دیموکراتیـەتێکی تـەواویش نـەبێت، واتـە بـە شـێوازێکی ڕاسـت پیـادەی

دیموکراتییەتی نەکردبێت وەکو ڕێزگرتنـــی مـافی مـرۆڤ و هەڵوەشـاندنەوەی هەموو ئەو یاسایانەی کە سەربەستی کەسەکان و کۆمەڵ زەوت ئـەکات بـۆ گوزارشـــت لـــە بـیروڕاو هەڵوێســتیان لــە ڕێگــەی حـزب و ڕێکخــراو و سەندیکاکانیانەوە، بەڵام پێویستە دەوڵـەتێك بێـت دەسـتورەکەی جیـاوازی بکـات لـە نێـوان دەسـەڵاتەکانی یاسـادانان و جێبـەجێ کـردن و داد دا، هەروەها پێویستە دەسگاکانی ئاسایش و سەربازی ڕۆلیان دیاریکراو بێت لە بڕیارە سیاسیەکاندا و بـە هـیچ جۆرێـك لـەو سـنورەی دەسـەڵاتی خۆیـان دەرنەچـن، هـەروەها هەڵبـژاردن ئـازاد بێـت وبـە پێـی یاسـا دیموکراتییـە ڕاسـتەقینەکان بێـت، ئەمـەش بناغـەی بـە دەوڵـەت بوونـە، لـە پێنـاوی دروستبوونی دەوڵەتی لەوجۆرە لەوڵاتەکانی ئێمـەدا واتـە دیمـوکراتی نـوێ، پێکهێنانی پێویستیەکانی درووستبوونی ئـەو دام و دەسـگا دیموکراتیانـە و کامڵ بوونیان لە لایەك و پەیوەست بوونی کۆمەڵ بەو دام و دەسـگایانە لـە لایەکی تر بۆ بەرژەوەندی هاووڵاتیان، پێویسـت بـە دەسـگاکانی چـاودێری ئەکات بۆ دەستەبەرکردنی جێبەجێ کردنێکـی پێویسـت، چـاودێرییەك لـە لایەن دەوڵەتەوە بۆ هاووڵاتیـان و چـاودێریەکیش لـە لایـەن هاووڵاتیانـەوە لەسەر دەوڵەت بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هەر لایەو بە ڕێکی بـە ئەرکـەکانی خۆی هەڵئەسێت و پاراستنی ئەو پەیوەندییەی نێوان هاووڵاتیـان و کۆمـەڵ لەگەڵ دام و دەسگا دیموکراتییەکانی دەوڵەت ئەکات، لە لایەکی تریش ئـەو دەسـگا چـاودێریانە سـنورێك بـۆ بـەرتیل و سـاختەکاری و گەنـدەڵی و بەفیڕۆدانی سامانی گشتی دائەنیت و ڕێگە لە ڕوودانیان ئەگرێت،وائـەکات حکومەت لە کارەکانیـا ڕوون و ئاشـکرا بێـت، هـەروەها دامـەزراوەکانی کۆمـــەڵیش وەك دەســـتە هەڵبـــژیردراوەکانی ناوچـــەکان دەســـتەکانی شارەوانیەکان وئـەحزابی سیاسـی و سـەندیکاکان و هـەموو ئـەو کۆمەڵـە

ڕۆشنبیری و پیشەییانەی لە بوارە جیاوازەکاندا هەن کە ئەمانە هەموو ئـەو دەستانەن کە بە شێوەیەکی دیموکراتییانە هەڵبـژێردراون، ئەگـەر ئـەو هـەم ئاهەنگییە لە نێوان دەسـگاکانی دەوڵـەت و ئـەم دەسـتانەدا هـەبوو ئـەوا ئەومەرجە سەرەکیە پێکهاتوە بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی کاملی دیموکراتی کە دەستەبەری ئەم ئامانجانە بکات : بناغەیەك بۆ سەربەسـتی، ڕێزگرتنـی مافی تاك،پاراسـتنی مافـەکانی تـاك وکۆمـەڵی هـاوولاتی، پێشـکەوتنی ئابووری، پاراستنی ژینگـە، بـەهێزکردنی زانسـت و فێربـوون لـە قۆناغـە جیاوازەکانـدا، دەسـتەبەرکردنی هۆکارەکـانی پێشـکەوتنی ڕۆشـنبیری وکەڵەکەبوونی زانیاری،بەدەستهێنانی دادپەروەری کۆمەلآیەتی لـە ڕێگـەی دەستەبەرکردنی دڵنیایی کۆمەلآیەتی وخزمەتگوزاری و چارەسـەری بیمـەی بێکاری،هەروەها خسـتنەگەڕی تواناکـانی نـاوخۆ بـۆ ڕێگـرتن لـە کۆچـی خەڵکانی بە توانا، بەلآم ئەم دەوڵەتە دیموکراتییە نوێیە پێویسـتە عیلمـانی بێت ئینجا ئەتوانێت دیموکراتی بێت، ئەبی لە داموو دەسگاکانیا جیاکـاری هەبێت لە نێوان ئاین و سیاسەت و لە نێوان سیاسی و پیرۆزیدا، تەنانەت لە کاروباری کەسێتیشدا ئەبیَ دەسگاکانی سـەر بـە دادگاکـان بێـت و مـافی کەسەکان هەبێت چی دەربارەی کەسـێتی خۆیـان هەڵئەبـژێرن، چ لـە ڕووی ئاینی و چ لە ڕووی مەدەنییەوە، و خۆیـان بڕیـار بـدەن یاسـایەکی چـۆنیان دەربارەی باری کەسپتی ئەوێت، بەڵگە نەویستیشە دەوڵەتێکی دیموکراتی وا پێویستی بـەڕژێمکی دیموکراسـی ئـەبێت کـە هـەموو یاسـاکانی دەوڵـەت چوونیەك بێت، مەبەسـت لەوەیـە سەرچـاوەی بڕیـار یـەك بخرێـت، ئەمـە دەسەلآتی یاسایی ئاینییە و ئەمەیان مەدەنییە تیـا دەرنەکـەوێت و بـوونی نەبێت بەبی ئەوەی یاسا کەسێتی خۆی لەدەست بدات، بـبن بـە یـەکێك لـە دادگاکانی دەوڵەت، ودووربێت لە چاودێری سەرچاوە ئاینییـەکان (المرجعـات

الدينيه) وتەواو سەربەخۆ بێت،ئەوەی سودی زۆرە لە جیاکردنـەوەی ئـاین و دەوڵەتدا ئەوەیە کە ئاین بە خراپی بەکار نایـەت لـە لایـەن دەوڵەتـەوە بـۆ بەرژەوەندی هەندێك و لە لایەکی تریش ئاین خراپ ناکرێت و وای لێبکرێت کە بەها ڕۆحیەکەی خۆی لەدەست بدات و هەندێك شتی بەناوەوە بکرێت کە ئـەرکی ئەونییـە، ئـەرکی ئـاین ڕێنیشـاندەری و بانگـەوازە بـۆ چـاکەو خۆشەویستی و دادپەروەری و یەکسانی، بێ بەکارهێنانی زۆر و ناخۆشـی و خەڵك بـەکافر سـەیرکردن، هـەروەها بـێ بـەکارهێنانی دەسـەڵات بەسـەر دەوڵەت و دەسگاکانی وزۆرەملێ کردن بەسەریانەوە کە زۆر لە وڵاتانی ئێمە بـاجی زۆری ئـەم جـۆرە دەسـتێوەردانەیان داوە کـە لـە لایـەن ڕێکخـراوە ئاینییەکانەوە پیادە ئەکرێت، بە ناوی ئاینەوە و بە پێی بۆچونەکانی خۆیـان یاساو ڕێسایان سەپاندووە بەسەر خـەڵکا و سەرپێچـیکارانیان(بە بۆچـوونی ئەوان سەرپێچیکار بوون) بـەگیر هێنـاوە و کـاری ناشایسـتەیان بەرانبـەر کردوون، و هانی ڕسواکردن و کوشتنیان داون، زۆرجار بـە ڕێکـەوتن لەگـەڵ هەندێك لە ناو دەسەڵاتدا لە جیاتی دەوڵەت بەم کارانە هەستاون ، بەمـەش ڕژێمی چەوساندنەوە و سەرکوتکاری بەرهەم دێت و دێتە ئاراوە .

کاتی ئەوە هاتووە لە بیرکردنەوەماندا و لە پیادەکردندا جیاوازی بکەین لە نێوان دەوڵەت وەکو دەسگایەکی یاسایی خاوەن سـەربەخۆییەکی ڕێـژەیی سەبارەت بە چینە کۆمەلایەتیەکان و هێزە سیاسـیەکان، و لـە نێـوان ئـەو دەسەڵاتانەی کە بە هەڵبژاردن دێنە پێشەوە بۆ ناوەندی بڕیار، کە بـەردەوام لـە گۆڕاندایـە و کـاتی ئـەوە هـاتووە ڕزگارمـان ببێـت لـە دەسـەڵاتی سەرکوتکاری تاکە کەسی و تایەفەگەری و خێڵەکی و خێزانی، کـاتی ئـەوە هاتووە لە وولاتەکانماندا دەوڵەت سەروەر بێت و سەربەخۆیی تەواوی هەبێت لە دەسگا ئاینییەکان و بڕیارە کوێرانەکانیان، تا لە تایەفەگەری و مەزهەبی

دوور بکەوینەوە کە بەکار ئەهێنرێ لە لایەن هەندێك هێزی سیاسیەوە بۆ نەهێشتنی دروستبوونی دەوڵەتێکی دیموکراتی، کاتێك دەوڵەت ڕزگاری ئەبێت لەم سەرکوتکارییە، کاتێك دەوڵەت سەربەخۆیی بەدەست ئەهێنێ و ڕزگاری ئەبێت لەو دەسگا ئاینی و دابەشبوونە تایەفەگەری و مەزهەبییە، ئەوکاتە بنەماکانی دەوڵەتیکی دیموکراتی پێوە دیارە و ئەبێتە دەوڵەتێکی دیموکراتی نوێ، کە ڕێزی ئاینیش ئەگرێت و سەربەخۆییش ئەدا بە ئیمانداران و مافەکانی مرۆڤیش ئەپارێزی و ڕێز لە سەربەستیشیان ئەگرێت.

دۆزی دووەم :پەیوەستە بە کۆمەڵگەی مەدەنی و دامەزراوە جیاوازەکانییەوە، کۆمەڵگەی مەدەنی لە بری کۆمەڵگەی ئەهلی، بە پێچەوانەی کۆمەلگەی مەدەنیەوە کۆمەلگەی ئەهلی بریتییە لە خێڵ و بنەماڵەو ڕەوتی ئاینی جیاواز لە نێوان خۆیاندا، بەڵام کۆمەلگای مەدەنی بریتییە لەدابەشبوونی هاووڵاتیان لە نێوان حزب و ڕێکخراوو کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و پیشەیی و خاوەن کارە سەربەستەکان، من وای ئەبینم کە دەرکەوتنی ئەو کۆمەڵگە مەدەنیانە دیاردەیەکی دیموکراتیانەیەو مرۆڤانەیە، بەڵام ئەم کۆمەلگە مەدەنیانە بەردەوام پێویستیان بە خۆ نوێکردنەوە و نوێکردنەوەی ئەرك و ئامرازەکانی تێکۆشان هەیە و پێویستیان بە گەشەسەندنی زیاتر هەیە بە ڕێڕەوی دیموکراتیەت و ڕووناکبینیدا و بە ڕێڕەوی گرنگیدانێکی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیدا .

دۆزی سێیەم : پەیوەستە بە مەسەلەی نیشتمانپەروەرییەوە، ئەمەش لەوەدا چڕ ئەبێتەوە کە نیشتمانپەروەری لە هەر وڵاتێکدا بریتییە لە بەرگریکردن لە ژێر سایەی دەوڵەتدا و بە هەموو شێوازێکی بەردەست و

لە ئاستی تواناادا لە سەربەخۆیی و سەرفرازی نیشتمان، ورێگە گرتن لە هەردەست تێوەردانێکی دەرەکی لە کاروباری وولآت و سەربەخۆیی و سەروەری وولآت هەردووکی یەك مانای هەیە، لەبەر ئەوە دەست تێوەردانی ولآتێکی عەرەبی بۆ وولآتێکی عەرەبی تر هەر کارکردنەسەر سەربەخۆیی و سەروەری ئەو ولآتەیە و هیچ بیانویەکی بەجێ نییە بۆ ئەو دەست وەردانە، هیچ هۆکارێك و هیچ بیانویەك و هیچ دروشمێك قەومی بێت یا ئاینی پاساوی ئەو دەست خستنە کاروبارەی ولآتێکی تری عەرەبی ناداتەوە لە لایەن ولآتێکی عەرەبیی ترەوە، کە ئەمە ڕوویدا ئەوا گومانی نییە کە بەرژەوەندییەك هەیە بۆیە ئەوەی کردوە، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پێویستە ئەوە بلێین، هیچ ولآتێکی گەورەی عەرەبی بۆی نیە خۆی بە پارێزەر و دەمڕاست و بەرگریکار لە وولآتێکی تری بچووکی عەرەبی بزانێت و ئەگەر ئەمەی کرد ئەوا سەروەری و سەربەخۆیی ئەو وولآتە بچووکە پێشێل ئەکات، بە هەمان شێوە هیچ ولآتێکی عەرەبی بچووك یا گەورە نابێت ڕێگە بدات زەوی خۆی بەکار بێنیت بۆ پیلان دانان دژ بە وولآتێکی تر، هەروەها هیچ حزبێکی ئاینی بۆی نییە لە ژێر پەردەی بەرگریکردن لە ئاین لە وولآتێکی تردا پەیوەندی ببەستێت لەسەر حسابی ولآتەکەی خۆی، ولەناو وڵاتەکەی خۆیدا نوێنەرایەتی دەوڵەتێکی دەرەوە بکات، تێکۆشان لە پێناو سەربەخۆیی ولآتدا و دژی داگیرکەرێکی دەرەکی مەسەلەیەکی بناغەیی و سەرەکییە بە هەموو شێوە و توانایەك و ئەچێتە خانەی نیشتمانپەروەری و داکۆکی لە سەربەخۆیی وولآت،بەلآم ئەم تێکۆشانە مەرجی نیشتمانپەروەرێتی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەبێ لەژێر سایەی دەوڵەتدا بێت و بە هۆی و بە هاوکاری دەسگا سەربازی و ئاسایشەکانی دەوڵەت بێت و بە یەکگرتویی گەل بێت بە هەموو

پێکهاتەکانیەوە، ئەو بەرگریکردنە لە لایەن تیپێك یا دەستەیەکەوە نەبێت وبە هەر بیانویەك بێت نابێت لە ژێر ڕکێفی دەوڵەت دەرچێت، لە کاتێکدا کە دەوڵەتەکەش دەوڵەتێکی دیموکراتی بێت ، کە ئەو دەستەیە بۆخۆی بانگەشەی شەڕ و بەرگری بکات بە تەنها بەبێ بەشداری هاوولاتیان و گروپەکانی تر، یا بەبێ ئاگاداری و پەسەندکردنی دەوڵەت لە ڕێگەی دەسگا سەربازی و ئاسایشەکانیەوە، (نوسەر دیارە لەم ڕووەوە داخی زۆری لە دلآیە و هەموو ئەوانەی کە باسی لێوە ئەکات لە وولآتەکەی خۆیدا ڕووی داوە، ئەوە ئەو گروپانەی کە لەگەڵ سوریا یەکیان گرتبوو سوریایان هینایە ناو لوبنانەوە، کە ئەمە پێشێلکردنی سەربەخۆیی لوبنان بوو، ئەوە گروپە ئیسلامیەکان کە لەگەڵ ئێران لەژێر سێبەری ئایندا ڕێکەوتوون و یارمەتی لێوەر ئەگرن و کێشەیان بۆ لوبنان دروستکردوە لەگەل ئیسرائیل لە دەرەوەی هاوبەشی لوبنان وەك دەوڵەت و دەیان نمونەی تر — وەرگێڕ) کە ئەمانەش ئەبێتە هۆی شلۆق کردنی سەربەخۆیی و هەستی نەتەوایەتی و ناخۆشی بارودۆخی ولآت، و ئەبیتە هۆی پەرتبوون ودابەشبوون ڕوودانی شەڕی ناوخۆی ئەهلی وئەمانەش وا ئەکات کە دەرەکی دەست بخاتە کاروباریەوە بە بیانوی هاوکاریکردن و ڕزگارکردنی لەو قەیرانە،کەواتە سەربە نیشتمان و دەوڵەت و پەیوەستبوون پێوەی بەردی بناغەی نیشتمانپەروەرییە لای هاولآتی، ئینتیما و سەر بوون بە هەر بیروباوەڕ وئاین و سیاسەتێك و بنەماڵەیەك مافێکی تەواوی هەموو کەسێکە بەمەرجێك نەخرێتە سەرو پابەندبوون بە نیشتمانپەروەریەوە، بەڵکو ئەبێ هەموو ئەو پابەندبوونانە لە خزمەتی پابەندبوونە سەرەکییەکەدا بێت بە نیشتمانەوە و بەو دەوڵەتەوە کە لەچوارچێوەی یاسای ئەو وولآتەدایە، تەنها ئەو پابەندبونەیە یەکێتی نیشتمان و یەکێتی ڕۆلەکانی بەهێز ئەکات، بەلآم شێوازی بەرەنگاربونەوەی

دوژمنی دەرەکی و تێکۆشان لە پێناو ڕزگارکردنی خاکدا کە هێزێکی دەرەکی داگیری کردبێت پابەندە بە هاوڕایی نیشتمانییەوە و لە ژێر سایەی دەوڵەت و دامەزراوە سەربازییەکانیدا، ئەو تێکۆشانە یەك شێوازییە سەرکەوتن بەدەست ئەهێنێ بە کەمترین زیانی گیانی و مادی ، لەبەر ئەوە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی خاك، ڕزگارکردنی مرۆڤیشە لەو وڵاتەدا، بۆیە پێویستە دەربەستی گیانی خەڵك بین و خوێنیان بەفیڕۆ نەدەین، بە تایبەتی لە کاری بێبەهای خۆکوژیدا، ئێستاش کاری دیپلۆماسی باشترین شێوازی تێکۆشانی سیاسیە و لە لایەن زۆر لە گەلانی جیهانەوە پێڕەو ئەکرێت لە مێژووی تێکۆشانی گەلاندا بۆ ڕزگاری وولات پێڕەو کراوە، بەکارهێنانی چەك شێوازێکی ڕاست نییە لە هیچ بارودۆخێکدا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، ئەزموونی گەلانی تریش کە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ئەو نموونانەن کە ئەهێنن سوود لە باشەکانیان و خراپەکانیان وەربگرین .

دۆزی چوارەم :پەیوەستە بە بەدەستهێنانی مەرجەکانی پێشکەوتنی ئابووری و دەربازکردنی وڵاتەکانمان لەو دواکەوتنەی کە باڵی بەسەردا کێشاوە، ئەگەر پلانی ئابووری زوربەی ئەو وڵاتە عەرەبیانەی کە سیستەمی تایبەتی(کەرتی تایبەت) تیا پێڕەو ئەکرێت نشوستی هێناوە و لە گەڵێشیا کەرتی گشتی (مەبەست دەوڵەتە —وەرگێڕ) بۆتە کانگای گەندەڵی وبەفیڕۆدانی سامانی دەوڵەت و بۆتە هۆی دەوڵەمەندبوونی نابەجێی ئەوانەی ئەیبەن بەڕێوە لە بری دەوڵەمەند بوونی دەوڵەت، لەبەرانبەردا ئەوەی بە کرانەوەی ئابووری لەقەڵەم ئەدرێت بەرانبەر ئەو پلانە، بە جۆرێکی تر داڕووخانی ئابووری نیشتمانی بەدوای خۆیدا هێناوە (ئەو بازارە کراوەیە زەرەرێکی زۆر لە بەرهەمی ناوخۆ ئەدات و بازارەکان پڕ ئەبن لە کاڵای بێگانە کە بەرهەمە ناوخۆییەکان ناتوانن کێبرکێ و ڕکەبەریان بکەن

و بەو هۆیەوە تووشی زیان ئەبن و ناچار ئەبن کارگەکانیان دائەخەن، تـەنها چارەسەر بۆ ڕێگرتن لە ڕوودانی ئەو زیانە و پاراسـتنی بەرهـەمی خۆمـاڵی دوو ڕێگە هەیە یەکێکیان یا ڕێگرتن لـەو کاڵایانـەی کـە هاوشـێوەیان لـە بەرهەمی خۆماڵی و نیشتمانی هەیە کـە ئـەم ڕێگەیـە ڕوبـەڕوی ڕەخنـەی ئەوانە ئەبێتەوە کە لایەنگری بازاڕی ئازادن و بە پێی ئەمان ئەبێت هـەموو کەس لە بازرگانان بۆیان هەبێت چ کاڵایەك هاوردە ئەکەن ڕێگریان نـەکرێت ، ڕێگەی دووەمیش ئەوەیە کە باج و گومرگ زیاد بکەن لەسەر ئـەو جـۆرە کاڵایانە تا نەتوانن لەخوار نرخی کـاڵا نیشـتمانیەکەوە بیفرۆشـن و کـاڵا و بەرهەمە ناوخۆییەکان دەرەقـەتی ئـەو خسـتنە بـازاڕەی ئـەوان بـە نرخـی هەرزانتر بێن- وەرگێڕ) کەواتە ئەبێ ڕێگەیەکی ناوەڕاست لـە جـۆرێکی تـر بگیرێتەبەر و پلانی بۆ دابنرێـت لـە خزمـەتی ئـابووری و کۆمەڵایەتیـدا و پەیوەندیاندا هەبێت، ئەبێ ڕەچاوی ئەو گۆڕانکارییـە گەورەیـەی جیهـانیش بکرێت، کە بە شێوەیەکی زۆر خێرا هەموو جیهان بەیەکەوە بەستراون و بـە شێوازی جیاواز و پێوەری جیاواز بەیەکەوەن، لەبەر ئەوە قسەکردن لـە سـەر گەشەکردن بە شێوازە کۆنەکە بۆ ڕزگاربوون لە پاشکۆیەتی هیچ بنەمایەکی بـەهێزی نییـە، پێویسـت بـە دڵنیاکردنـەوە ناکـات کـە هـەموو وڵاتێـك شێوازێکی تایبەتی گونجاوی بۆخۆی هەیە بۆ گەشەکردن، گەشـەکردنێك کـە دەوڵەت و کۆمەڵگاو هـەموو دامـەزراوەکانی پارێزگـاری لـە سـەربەخۆیی وڵات بکەن تیایدا، وەك گرنگییەکی یەکەم، گرنگترین لەو مەرجانە ئەوەیـە لە بواری ئابووریدا دەوڵەت هـەوڵی پاراسـتنی سـامانی گشـتی نیشـتمانی بدات، وبە شێوەیەکی درووست لە پێنـاوی گەشـەکردنی ئابووریـدا بـەکاری بهێنێت، چاودێریی لەسەری توند بکات و نـەهێلێت گەنـدەڵی و بـەفیڕۆدان بیگرێتەوە، هەروەها دەوڵەت لەسـەرێتی چـاودێری وردی ئـابووری کـەرتی

تایبەت و کەرتی هەرەوەزیش بکات، تـا ڕێگـە لـەو چـالاکیە ئابوورییانـە بگرێـت کـە ولاَت بـەرەو قـەیران ئەبـەن، هـەروەها دەسـتگیرۆیی کـەرتی بەرهەمهێن لە بواری کشتوکاڵ و گەشتووگوزاردا بکات، بـە شـێوەیەك کـە ڕۆڵی ئەوانە بەهێز بکات و بازاڕیـان گـەرم بکـات، چ لـە نـاوەوە و چ لـە دەرەوە، بەرژەوەندی ئەوانەش بپارێزی کە لەو بووارەدا کار ئەکەن .

دۆزی پێنجەم : پەیوەندی هەیە بە سامانی سروشـتیەوە،کە سـامانێکی گەورەی ولاَتە عەرەبیەکانە، بەرهەمهینرابێت یا نا بە سـامانێکی گـەورە و سەرچاوەیەکی گەورەی گەشەکردنی ئابووری دائـەنرێت، بـەلاَم لـە ڕاسـتیدا پێچەوانەکەی  بەدەست هاتووە، بە زۆر شێواز، ئەو سامانە سروشتیانە کـە بەو زۆرییە هەن نە وەك پێویست بـەکار هێنـراون، نـە دەسـتگیرۆیی هـیچ ولاَتیکی هەژاریان پێکراوە، نە لە ولاَتیشـدا بۆتـە هـۆی خۆشـگوزەرانی و پێشخستن و گەشەسەندنی ئابووری، بەڵکو بە شێوەیەکی ناشایستە یا بۆتـە هۆی دەوڵەمەندبوونی حوکمڕانە دەسەلاَتدارەکان، یا بۆتە جێی تەماع و چاو تێبڕینی هێزە دەرەکیەکان کە زاڵن بەسەرماناو بە ئارەزوی خۆیـان بـەکاری ئەهێنن، لە لایەکی تریشەوە ئەوە بۆتە هۆی جیاوازی لـە بـارودۆخی ولاَتـە عەرەبیەکانـدا لـە ڕوی سـامانەوە،زاڵی گەنـدەڵی زوربـەی دەسـەلاَتدارە حوکمڕانەکان، نەك گەندەڵیەکە کە تەنها بوویێتـە هـۆی دواکـەوتنی ولاَت، بەڵکو بۆتە هۆی دواکەوتن و هەژار بوونی زوربەی هەرە زۆری خەڵك، لەبەر ئـەوە سیاسـەتی بەگەڕخسـتنی سـامانی سروشـتی ولاَت بـۆ پێشخسـتنی ئابووری لە ولاَتەکانماندا ئەمڕۆ پێویستە لە گرنگیەکانی پێشەوە و بە پلـەی یەکەمی ئەرکی چـەپەکان بێـت بـە تایبـەتی و بەگشـتی جێگـەی گرنگـی پێـدانی هـەموو ئـەو هێزانـە بێـت کـە مەبەسـتیان گۆڕانـە بـە هـەومو ڕەوتەکانیەوە .

دۆزی شەشــەم : پەیوەســتە بــە گەشەســەندنی کۆمەلاّیەتییــەوە، ئــەو گەشــەیەی ڕاســتەوخۆ پەیوەنــدی بــە مرۆڤــەوە هەیــە، بــە ژیانیــان و بــە گوزەرانیان و دلّنیایی تەندروستی و کۆمەلاّیەتی لە هەموو ڕوویەکەوە، لــە پێشەوەی هەموو ئەو پێویستیانەوە دابینکردنی هەلی خوێنــدن و فێربــوون بۆ هەموو کەسێك و یارمەتیدانیان بۆ بەدەستهێنانی ڕۆشــنبیری و زانیــاری لــە هــەموو بوارەکانــدا، لەگــەلّ ڕێزگرتنــی ئارەزووەکانیــان و هەلّبــژاردنی شێوازی ژیانیان لە لایەن خۆیانەوە،و ڕێزگرتنی مافەکانیان وەك هــاوولاّتی، گرنگیدان بە گەشەســەندنی کۆمەلاّیــەتی ئەتگەیەنێتــە ئــەوەی کــە تــاك و کۆمــەلّ ئــەو مرۆڤــە کۆمەلاّیەتییــەن کــە بــەردی بناغــەی بنیاتنــانی نیشتمانن،ئەوەش کە بەلّگە نەویستە ئەوەیە کــە دادپــەروەری کۆمەلاّیــەتی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و دور لەوەی کە تەنها خەیالّ بێت، چــوار بنــەمای ســەرەکی ئاســتەکەی دیــاری ئــەکات کــە هەرچواریشــیان پەیوەســتن بــە یەکەوە،یەکەم : ئاستی پێشکەوتنی ئــابووری تــا چــەند بەدەســت هــاتووە، دووەم : دیموکراتیەت تا چەند لە وولاّتدا جێگیر بوە چ لە ڕووی سیاسی و چ لە ڕووی کۆمەلاّیەتییەوە و تاچەند کاریکردۆتە ســەر سیاســەتی حکومەتــە یەك لەدوای یەکەکان، ئەوەی پەیوەندی بــە بەرنامــەو یاســا گشــتیەکانەوە هەیە و مافەکانی هاوولاّتیان ئەپارێزێت  بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەنــدی بە ژیانی ڕۆژانەیانەوە هەیە، سێیەم : تا چەند پەیوەنــدی نێــوان دامــەزراوە دیموکراتیەکانی حکومەت و دامەزراوەکانی  کۆمەلّەی مــەدەنی بــەدیهاتوە لە هەموو ڕوویەك و هەموو بوارێکدا، چونکە پێکهاتەی ئەو لایەنانە وا لــە هاوولاّتیان ئەکات وەك یەك  پارچە بەیەکــەوە لــە وەرشــەیەکی حکومەتــدا هەولّی دامەزراندنی بنەمای نیشتمان بدەن، چــوارەم : بریتییــە لــە ئاســتی توانای هێزە دیموکراتیەکان، بە تایبەتی دامەزراوەکانی کۆمەلّــەی مــەدەنی

وەك سەندیکای کرێکاران و کۆمەڵە کۆمەلایەتیەکانی تر هەموویان کـە تـا چەند بەرنامەیان ئامادەیە و توانایان هەیـە بـۆ هۆشـیارکردنەوەی خـەڵکی دەربارەی ئەرك و مافەکانی خۆیان، ئەمە وەك لایەنی یەکەم، لایـەنی دووەم تا چەند ئامادەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، لایـەنی سـێیەم ڕاکێشـانی هاووڵاتیان بەلای خۆیاندا بۆ هاتنە ڕیزی تیکۆشانی دیموکراتیانە و بەرگری لە مافەکانی خۆیان بکەن و بەرەنگار ببنەوە بۆ هەر دەسەلاتیك کە بیـەوی لە ڕێگەی دارِشتنی هەندێك یاساوە ئەو مافانەیان لێ زەوت بکات یا کاری نارِەوایان لەگەڵ بکات .

دۆزی حەوتـەم : پەیوەنـدی هەیـە بـە دەسـتەبەرە کۆمەلایەتییەکانـەوە (الضمانات الاجتماعیـة )، لە پـێش هەموویانـەوە دڵنیـایی تەندروسـتی کـە پێویسـتە هەمووکـەس بگرێتـەوە بـەبێ جیـاوازی، لەبـەر ئـەوەی ئـەو خزمەتگوزارییە لە ولاٌتانی ئێمـەدا بـە تـەواوی جیچـبەجی نـەکراوە و لـە هەندێك ولاٌتیشدا هەر نییە، نەبوونی ئەم دڵنیاییە لە کۆمەڵگادا هـەژاریی و نەخۆشی زیاد ئەکات، ئەمیش خەڵکی بەرەو جادو شتی پروپـوچ ئـەبات، جگە لەوەی پیسبوون ئەخاتەوە بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە، لـەم بوارەشـدا کێشەی نیشتەجێ بـوون هەیـە بـە تایبـەتی لـە گەڕەکـەکانی دەوروبـەری شارەکاندا کە بۆتە کێشەیەکی گەورەی کۆمەلاٌیەتی، ترسـناکترین دیـاردەی ئەم بێ جێیە ئەوەیە لە زۆر شوێندا قەبرسانەکان بوونەتە شوێنی نیشـتەجێ بوون، کە ملیۆنـەها خـەڵکی ڕووی تێئەکـەن بـۆ نیشـتەجێ بـوون، بۆیـە پێویستە لەسەر دەوڵەت کە پلانی هەمەجۆری هەبێت بۆ چارەسەری کێشەی نیشتەجێ بوون، وەك یەکێك لە پێداویسـتیەکانی مـرۆڤ و پەیوەندیـدار بـە ژیانی خەڵك ومافی هاووڵاتیانەوە وەك ئەرکێکی دەولەتی دیموکراتیش.

دۆزی هەشتەم :ئەمەیان پەیوەندی هەیە بە گرنگیدان بە ڕۆشنبیری و زانستەوە بە هەموو لقەکانیانەوە، وەك بەرهەمهێنان و بلاّوکردنەوە، بە هەموو شێوازەکان و لە هەموو بوارەکاندا، کە گرنگترین بواریش خوێندنگە و زانکۆکانە، کە پێویستە بکرێتە خوێندنێکی فەرمی (واتە دەولّەت پێی هەستی — وەرگێڕ)بۆ هەموو قۆناغەکان کە ئەمەش دەستەبەری سەرەکییە کە پشتی پێ ببەستریّ بۆ بەرهەمهێنان و بلاّوکردنەوەی خوێندەواری و زانست، وەنەبێت لە ڕۆڵی دەسگا زانستییە تایبەتییەکان کەم بکەینەوە، گرنگ ئەوەیە بە هەموو لایەك دەستەبەری بلاّوبوونەوەی خوێندەواری و زانست بکەین بە تایبەتی لە ئاستە بەرزەکانی خوێندندا، بۆ ئامادەکردنی توانای زانستی گونجاو لەگەلّ سەردەمەکەدا، تا دواتر بتوانین ئەو خاوەن توانا بەرزانە بخەینە بازاڕی کارەوە لە دەسگاکانی دەولّەتدا و سوودیان لێوەربگیرێت، کاتێکیش باس لە بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیری، ئەکەین بە هەموو لقەکانیەوە ئەبیّ ڕەچاوی ئەوە بکەین کەئەدەب و هونەریش لقن لەو ڕۆشنبیرییە، جگە لە جۆرەها لقی تر، ئەو بەرهەمهێنانە ئەبێت بەتاکیش و بە کۆمەڵیش بێت،ئەم فێرکردنە بە تاك و بە کۆمەل بۆ بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیری دەسگا ڕۆشنبیریەکان و مەڵبەندەکانی لیکۆلینەوە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و دەسگاکانی بلاڕوکردنەوە ڕۆڵی تیا ئەبینن، بەلاّم حکومەتیش ئەبێتە پالّپشت و تەواوکەری ئەو ئەرکە، کە ئەمەیان تائێستا لە ولاّتانی ئێمەدا ونە پێویستیش بە بەلّگە ناکات کە ئەدەب و هونەر ڕۆلێکی باشیان هەیە بۆ گوزارشت کردن لە رۆحی گەل و ئاستی ولاّتان و بنیاتنانی نیشتمان .

دۆزی نۆیەم : پەیوەندی هەیە بە لێکۆلینەوەی زانستییەوە، زانستەکان و مەلّبەندەکانی لێکۆلینەوەی زانستی ڕۆلێکی گەورەیان هەیەو پێویستە

لەسەر دەوڵەت کە بەرپرسیارێتی بنیاتنان و گەشەکردنیان بگرێتە ئەستۆی خۆی، پارەی باشی بۆ تەرخان بکات بۆ دامەزراندن و بۆ لێکۆڵەرەوەکانیش، لێکۆڵینەوەی زانستی هۆکارێکی گەورەی پێشکەوتنی ولاّتە لە هەموو روویەکەوە، بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە لە ولاّتانی ئێمەدا دەوڵەت ئەو گرنگییەی بەم لایەنە نەداوە، کە ئەمەش کاریگەری خراپی هەیە لەسەر پێشکەوتن لە لایەك و لە لایەکی تریش ئەبێتە هۆی ئەوەی خاوەن توانا زانستیەکان کۆچ بکەن بۆ دۆزینەوەی فرسەتی کارکردن لە بوارەکەی خۆیاندا

دۆزی دەیەم : پەیوەندی هەیە بە گرنگیدان بە کلتووری رۆشنبیری و کۆمەلاّیەتییەوە، کە ناسنامەی گەل دیاری ئەکەن ، چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ، شانازیکردن بەو ناسنامەیە و پەیوەستبون پێوەی، توخمەکانی کەسێتی نیشتمانی دیاری ئەکەن، کە بەبێ ئەوە کییانی نیشتمانیی یەکگرتو پێکنایەت و پێشناکەوێت و سەربەگەل و نیشتمان بە شێوەیەکی یەکگرتو پێك نایەت، بەلاّم شانازیکردن بە کلتوور و پەیوەست بوون بە نیشتمانەوە ئەوە ناگەیەنێت کە داخراوبین لەسەرخۆمان و ببێتە هۆی بێبەش بوونمان لە تێکەڵ بوون لەگەڵ گەلان و رۆشنبیری گەلانی تردا، کە ئەو تێکەلاّوبوونە توانایەکی راستەقینە ئەرەخسێنی بۆ بەدەستهێنان و بەرهەمهێنانی زانیاری، کارکردنیش بەو ئاکارەدا هۆکارێکی سەرەکییە بۆ پێشکەوتن لە ولاّتەکانماندا، و بۆ دروستکردنی پیشکەوتن لە دنیایەکی سەردەمیانەدا بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، پووختەی قسەکردن ئەوەیە، ناسنامەی نیشتمانی رۆشنبیریی لە بنەرەتدا بەردەوام پێویستی بە تازەبوونەوە هەیە، ئەوەش بە تێکەلاّوبوونی رۆشنبیریەکانی گەلان دەوڵەمەند ئەبێت، پێویستە رەچاوی ئەوەش بکەین کە ئێمە هەوڵی

پێشکەوتنی ولاْتەکەمان ئەدەین کە ئێمە بەشێکین لە جیهان، ئەو جیهانەی کە بابەتیانە یەککگرتوە لە ڕووی شارستانیەتی نوێـوە، بۆیـە پێویسـتە لـەو جیهانـە یـەککگرتوەدا ئـامرازێکی هاوبـەش بـین لـەو پینـاوەدا و ئـەو شارستانیەتە جیهانیە نوێیە کە پەیوەستە بەو یەکێتییەوە، بـە پیکهـاتن و تەبایی نێوان نەتەوە و گـەلان کامـلْ ئـەبێت بـۆ پێشکەشـکردنی خێـر و خۆشی بۆ هەموو مرۆڤایەتی و لە پێناوی ڕزگاربوون لە هەموو بەلاْیەك کـە تووشی ئەبێت لە مێژووی کۆن و نوێیدا .

دۆزی یانزەیـــەم : گرنگیـــدان بـــە لاوان، پێگەیانـــدن و فێرکردنیـــان، دۆزینەوەی هەلی کار بۆیان و دابینکردنـی هـەموو پێداویسـتیەکانی کـات بەسـەربردن وچـالاکی جەسـتەیی و شەوچـەرە و دابینکردنـی پێداویسـتیە تایبەتیەکانی دروستبوونی کەسێتییان، بەرەنگاربونەوەی بێهیواییان و بەرەو بێهودەیی چوونیان کە زۆر دەسگای پۆخل لە دەرەوە و نـاوەوە بـە هەنـدێك پرۆگرامـی ڕێگـە بۆکێشـراو هـەولی ئـەوە ئـەدات بـەرەو بـیْ هیـوایی وبێهودەییان ببات و هیوابڕاویان بکات ومێشکیان بیْ ئاگـا بکـات لـە زۆر ڕێگەی نادروستەوە ، جگە لـەوە هـەولْ ئـەدەن لـە ڕێگـەی دابـین کـردن و خستنە بازاڕی مادە هۆشـبەرەکان، کـە ئەمـەیان ترسـناکترین کـاری ئـەو دەسگا پڕوپووچانەیە بۆ هاندانی لاوان بۆ بەکارهێنانی مـادە هۆشـبەرەکان و لەو ڕێگەیەشەوە بردنیان بەرەو خراپـەکاری، کـە ئەمـەش دڕندانـەترین و قێزەونترین کاری تاوانکارییە بەرانبەر لاوان .

دۆزی دوازدەیەم: پەیوەندی بە مـافی ئافرەتـەوە هەیـە، وێـڕای ئـەوەی پێشکەوتنێکی باش بەدەست هاتوە لە بواری مـافی ئافرەتـا لـە وولاْتـانی ئێمە، بەلاْم تائێستا کەم و نیوە ناچلْیە، ئـافرەت تائێسـتاش ئـەنالْێنیْ بـە دەست چەوساندنەوە و زولْم و زۆرەوە، بێبەشکراوە لە بینینی ڕۆلْی ئاسـایی

خۆی له کۆمەڵدا، بەرپرسیارێتی شانبەشانی ئەمەی دەوڵەتیش لـە وڵاتـانی ئێمەدا هەندێك دامەزراوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بزوتنەوەی ئاینزایە کە هەندێك گووتار ئەهێننە ئاراوە کە لە ئاستی ئافرەت و ڕۆڵی ئـافرەت کـەم ئەکەنەوە، دۆزی ئافرەت لە بەرنامەی چەپ و هەموو هێزە دیموکراتیەکانـدا پێویستە جێگەیەکی تایبەتی هەبێت، کاتی ئەوە هـاتووە کـە ئـافرەت لـە هەموو دەسگاکانی دەوڵەتدا بە هەموو شێوازەکانیەوە ڕۆڵی خـۆی بـە بـێ جیاوازی ببینێ و وڵاتەکانمان دەوڵەمەنـد ببیـت بـەو توانـا بەهێزانـەی لای ئافرەت هەیە لـە هـەموو بوارەکـانی کـارو داهێنانـدا و لـە هـەموو ئـەو بوارانەشدا کە بەرپرسیارێتییەو توانای بەهێزی ئەوێت .(بەڕای من ئەم دۆزە پێداگری زیاتر و شـیکردنەوەی زیـاتری ئەویسـت و پێویسـت بـوو ئامـاژە بکرێت بەوەی تا ئێستاش ئافرەت لە زۆر وڵاتی عەرەبیـدا بێبەشـکراوە لـە زۆر لە مافە کەسێتییەکان و مافەکانی ژیانی تایبەتی و گشتی، تائێستاش لە زۆر وڵاتی عـەرەبیدا ئافرەت ڕێگەی پێنـادری خـۆی کاندیـد بکـات بـۆ پۆستە بالاکانی دەوڵـەت و تائێسـتاش لـە زۆر وڵاتـی عەرەبیـدا ئـافرەت مۆڵـەتی لێخـوڕینی ئۆتـۆمبیلی پێنادرێـت و تائێسـتاش لـە زۆر وڵاتـی عەرەبیـدا ئـافرەت بـەبێ کەسـێکی مـەحرەمی نـاتوانێ سـەفەر بکـات و تائێستاش لە زۆر وڵاتی عەرەبیـدا بـە پێـی شـەریعەتی ئیسـلامی ئـەڕۆن بەڕیوە و دووئافرەت بە یەك شاهید

دائەنرێت دوو ئافرەت لە میراتدا بەقەدەر یـەك پیـاوی پـێ ئـەبردرێت و دەیان و سەدان ناهەقی تر بەرانبەر بە ئافرەت — وەرگێڕ)

دۆزی سیانزەیەم : پەیوەندی بە توندڕەوییەوە هەیە کە لە وڵاتانی ئێمەدا شێوازی تۆقێنەر(ارهاب) ی وەرگرتوە ئیرهاب ئەوانەی پێی هەڵئەسن جـۆرە دروشمێکیان بەرزکردۆتەوە لە پەنا ئایندا بەکاری ئەهێنن، کە ئاین خۆی لـە

گەوهەری ناوەڕۆکەکەیدا و لە بەها ڕۆحیەکەیدا دووره لەو جۆرە کردەوانە، بێگوێدانە هەرهۆو بیانویەك کە بۆتە هۆی دروستکردنی ئەو ئیرهابە، پێویستە دەوڵەت و کۆمەڵگا بەرەنگاری ببێتەوە و بە تایبەتی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی نەهێڵێ نە حکومەت و نە دامەزراوەکانی و نە ئەو لایەنانەی تریش پێی هەستن، کە ئەمانە لە خۆیا دریژەدانە بە دەسەلاتی چەوساندنەوە لە ولاتەکانماندا بە هەموو شێوازەکانیەوە .

دۆزی چواردەیەم : پەیوەندی بە ژینگەو دەوروبەرەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بە پارێزگاریکردنەوە هەیە لە ژیانمان، پاراستنی ژینگەو ڕێگرتن لە وێرانبوونی وبەرگریکردن لە بوونە بیابان، پێویستیی بەردەوامبوونی ژیانە، ئەو مەترسیانەی کە بەرەوڕوی ژینگە ئەبێتەوە تەنها ئەوە نیە کە دەسەلات و هێزە بالادەستەکان لە ولاتانی ئێمەو هەموو جیهاندا بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن بێگوێدانە پاشەڕۆژی گەلان، بەڵکو خەڵکانێکی تریش کە خۆیان بەرژەوەندییان لە پاراستنی ژینگەدایە، بەلام ئەنجامی نەفامییان و خراپ بەکارهێنانی ئەبنە هۆی مەترسی، لەبەر ئەوە ئەبێت پرسی ژینگە ببێتە یەکێك لە بابەتە ڕۆشنبیریەکانی کە لە قوتابخانەکان و زانکۆکاندا گرنگی پێبدرێت و دابنرێت بە ڕۆشنبیریەکی نیشتمانیی، داسگاکانی کۆمەڵەی مەدەنیش گرنگی پێبدەن و چەپەکانیش و هەموو هێزە دیموکراتیە نیشتمانپەروەرەکانیش بیکەنە بەرنامەی خۆیان.

دۆزی پانزەیەم : بریتییە لە تێکۆشان دژی ڕژێمە سەرکوتکارەکان، دژی هەموو دەسەلاتەکانیان لە کاروباری وولاتدا و بە تایبەتی تێکۆشان بە دوو ئاقاردا : ڕێگای یەکەم :هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو یاسا نارێکانە و ڕزگارکردنی گەل و وولات لە هەموو هۆکارەکانی دەمکوتکردن و

بەربەستکردن لە سەربەستیەکان، هەروەها ڕزگارکردنی گەل و وەلاّت و هاوولاّتی لە ئامڕازەکانی سەرکوتکردن لە هەموو بوارەکاندا کە بە ناوی یاساوە ئانجامی ئەدەن،ڕێگای دووەم : ڕێگرتنە لە گەندەڵی کە لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا ڕەگی داکوتاوە لە لوتکەوە تا خوارەوە، کە بوونەتە هۆی دەوڵەمەندکردنی نابەجێی هەندێك لە ڕێگەی دزی و بەفیڕۆدانی سامانی گشتی و برسیکردنی زوربەی گەل و هێشتنەوەی وولاّت وەك کۆیلەی دواکەوتنێکی درێژخایەن .

دۆزی شانزەیەم : پەیوەندی هەیە بە کێشەی فەلەستینەوە، کێشەی فەلەستینی ماوەی سەدەیەکە بەردەوامە، ماوەی شەست ساڵە دوای دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلی تا ئێستا تەنها کێشەیە کە بێ چارەسەر ماوەتەوە و گەلی فەلەستینی باجێکی گرانبەهای ئەو چارەسەرنەبوونە ئەدەن، بەڵگە نەویستیشە هۆکاری چارەسەرنەبونەکەی دڕندایەتی ڕژێمی ئیسرائیلی و دوژمنکاری و داننەنان بە مافی گەلی فەلەستینیدایە، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ شەرمەزاری و چاوپۆشیکردن و بێ توانایی ولاّتەگەورەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، بۆ کارکردنی ڕاستەقینە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ئەمەش ڕوداوەکانی ئەو شەش گرێیە واتە ئەو شەست ساڵە سەلماندوویەتی، تەنگوچەڵەمەی ڕاستەقینەش جگە لەو دوو هۆکارەی کە باسمکرد کە ئیسرائیل و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بوو، ئەوەیە کە لە واقیعی فەلەستینی و عەرەبیدا حکومەتە عەرەبییەکان بەرپرسی سەرەکین لە ڕودانی کارەساتی فەلەستینیدا، لە سەرەتاوە کە بڕیاری دابەشبوون ڕویدا،حکومەتە عەرەبییەکان کەمتەرخەمبوون لە بەرانبەر ولاّتە گەورەکاندا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو بڕیارە و دەستکاریکردنیا لە بەرژەوەندی گەلی فەلەستینی، یا لە شەڕە ئابڕوچوەکاندا کە لەشکرە عەرەبییەکان کردیان بۆ

نەهێشتنی جیبەجێ کردنی بڕیارەکە لە ساڵی ١٩٤٨ دا و کۆتایی هاتنی بە نەگبەتی، یا ئەو جەنگانەی کە حکومەتە عەرەبییەکان بەرپایانکرد لە کاتی خراپدا و بەسەرخۆیاندا شکایەوە بە تێکشانیان لە ڕوی سەربازی و ئابووری و سیاسیشەوە، کە تائێستاش کاریگەریە خراپەکانی بەسەر شانی گەلەکانمانەوە بەردەوامە، خراپترینی ئەو بەرپرسیارێتیەش لە سەر هەندێك لە وڵاتە عەرەبیەکان،کە بە تاوانێکی گەورە دائەنرێت، ئەوەبوو کە وەستانەوە بەرانبەر بڕیاری نیشتمانیی فەلەستینی دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لەسەر خاکی فەلەستین،بە پێی بڕیاری دلڕەقانەی دابەشکردن، بەتایبەتی دوای نەهامەتیەکەی١٩٤٨ و دابەشکردنی خاکی فەلەستین لە نێوان بەشی ڕۆژئاوا- ئەردەن و بەشی غەزە — میسر، بەلاّم کێشەیەکی تریش کە ئەمەیان بنچینەی کێشەکەیە، ئەویش ناتەبایی نێوان بزوتنەوە نیشتمانییە فەلەستینییەکان بوو، کە لە هەندێك کاتدا بوون بەیەك لە ڕیزی یەکیتیەیکی فشەڵدا بەناوی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین (منظمة تحرير فلسطين) کە نەیتوانی ئەو یەکێتیە لە نێوان ڕەوتە جیاوازەکانیدا بەڕاستی پێکبهێنێت و گەشەی پێ بدات، تا بە پێی پێویست بتوانێ تێبکۆشێت لە پێناوی مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی فەلەستینیدا،بەڵکو بە پێچەوانەوە لەتبوون و لەبەریەك هەڵوەشان و کەوتنە ناکۆکی دەربارەی شێوەکانی تێکۆشان و دەربارەی کێ خاوەنی ڕۆڵی سەرەکییە لە بەدەستهێنانی چارەسەرێکی دادپەروەرانەی کێشەی فەلەستیندا، ئەم تەنگووچەڵەمانە لە دوو لاوە، لە لایەك فەلەستینی و لە لایەك عەرەبی ئەوەی دابەدەستەوە بۆ ئیسرائیلیەکان و بۆ هاوپەیمانەکانیشیان لە جیهاندا کە گەلی فەلەستینی لە سنوری ٤ یحوزەیرانی ١٩٦٧ دا نەتوانی مافی خۆی بەدەست بهێنێ لە دامەزراندنی

دەوڵەتێکی فەلەستینی سەربەخۆ و خاوەن قەوارەی خۆیٚ لەسەر خاکی خۆی، وپایتەختەکشی قودسی ڕۆژهەلاٚت بێت،ئەم واقیعە خەفەتاوییە وایکردوە کە کێشەی فەلەستین تا ئێستاش وەك کێشەیەکی عەرەبی لە وولاٚتانی عەرەب و لای گەلی عەرەبی وەك کێشەیەکی سەرەکی بمێنێتەوە و هەر وولاٚتە و بە گوێرەی توانای خۆی و بارودۆخی خۆی گرنگی پێبدات، ئەمەش پرسێکی دادپەروەرانەیە کە پێویستە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەولێ ئەوە بدات دادپەروەرانە چارەسەری بکات وەك ڕێزیك بۆ مافە ڕەواکانی مرۆڤ و مافی ڕەوای گەلان، بۆ بڕیاردانی چارەنووسی خۆی بە سەربەستی .ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە هاوکاری گەلی فەلەستین لە کاتی ئێستادا لەو تێکۆشانە ڕەوایەیدا یەکێکە لە مەسەلە هاوبەشەکانی دۆزی عەرەبی، هیچ ئاشتیەك لەگەڵ ئیسرائیلدا نییە بەبیٚ ڕزگارکردنی تەواوەتی هەموو خاکی داگیرکراوی عەرەب لە فەلەستین و سوریاو لوبنان، بەلاٚم ئەم ئامانجە گەورەیە مەرجی خۆی هەیە لە سیاسەتدا، چ لەڕوی فەلەستینییەوە یا عەرەبییەوە یا نێودەوڵەتییەوە، هەروەها ئەم ئامانجە مەرجی تایبەتی هەڵبژاردنی جۆری تێکۆشانیشی پێویستە بۆ بەدەستهێنانی، لە هەموو ئەو مەرجانەش گرنگتر ئەوەیە هەموو کەرتە فەلەستینییەکان ئەبیٚ یەك بگرن لە ناوخۆیاندا بۆ دارِشتنی بەرنامەیەکی نیشتمانی و واقیعی و دوور لە بڕیارو دەستێوەردانی دەرەکی بە هەرناوێکەوە و بە هەر بیانویەکەوە بێت، لەبەر ئەوەی بەردەوامبوونی ناکۆکی لە نێوان بزوتنەوە فەلەستینیەکاندا ئەنجامی خراپی نەك هەر تەنها بۆ فەلەستینیەکان ئەگەڕێتەوە،وەکو کێشەکەیان و گەلەکەیان،بەڵکو ئەکێشێتە وولاٚتە عەرەبییەکانی تر، بە تایبەتی دراوسێکانی فەلەستین، بە تایبەتی لوبنان کە تائێستا بە بەردەوامی باجی قورسی ئەو قەیرانانە ئەدات،

دۆزی حەفدەیـــەم : ئەمـــەیان پەیوەســـتە بـــە كێشـــەی كەمـــە نەتەوایەتییەكانەوە لە جیهانی عەرەبیدا، لە وولآتەكانی ئێمەدا كەمایـەتی هەیە، ئەو كەمایەتیانە یا كەمایەتی قـەومین یـا ئـاینین ، گەوهـەری ئـەم كێشەیەش ئەوەیە كە زۆرینە لە ولآتەكانی ئێمەدا عەرەب و موسوڵمانن،بە شێوەیەكی ڕەگەزپەرستانە لەگەڵ ئەم كەمایەتییانەدا مامەڵـە ئەكـەن، بـۆ نموونە كوردەكانی عێراق و كەمە نەتەوایەتییـەكانی تـر، و ئاینزاكـانی تـر هەروەها خوارو نشینەكانی سودان، یا ئەمازیغەكان لە مەغریب و جـەزائێر ئەمانە نموونەی زەقـن لـەو كێشـەیەدا، كـاتی ئـەوە هـاتووە كـە جیهـانی عەرەبیمان ڕزگاریان ببێت لەم شەرمەزارییە كە تووشی بوە بـەهۆی ئـەوەی كە دەسەلآتداران و گەل و ڕۆشنبیران لە گرنگی ئەم كیشەیە ناگەن و ناتوانن چارەســـــەرێكی بــــۆ بدۆزنەوە،لـــە پێنــــاوی یـــەكێتی ولآتــــە عەرەبییەكاندا،هەمەجۆری قەومیەت و هەمــەجۆری ئـاینی و هەمــەجۆری ڕۆشنبیری لە چوار چێوەی سیستمێكی دیموكراتی فرەییدا جێی ئەبێتـەوە و مافی هەموان ئەپارێزێت و كەمایەتیەكان بەرانبــەر ئەبنــەوە لــە مامەڵــە لەگەڵ كردنیاندا لەگەڵ زۆرینەكە و ماف و سەربەستییان پارێزراو ئـەبێت و شانازی بە ڕۆشنبیرییانەوە ئەكەن .

دۆزی هەژدەیــەم : بریتییــە لــە شــەونخونیكردن بــە دیـار تونـدكردنی پەیوەندی لە نێوان وولآتە عەرەبیەكاندا لە هـەموو بوارەكانـدا، ئـابووری و ڕۆشــنبیری و زانســتی، لــە ســەر بنــەمای پەیوەندییــە مێژووییەكــە و بەرژەوەندییــە هاوبەشــەكان، كــامڵبوونی ئــەم پەیوەندییــەش دەســتەبەری پێشــكەوتن و ڕزگــاربوونی ولآتەكانمانــە چ بــە تــەنیا و چ بەیەكــەوە، بــە مەرجێك كاریگەری بۆ سەر سەرووەری وتایبەتمەندی نیشتمانی هیچ لایـەك لـەو ولآتانــە نەبێت،جامیعــەی عــەرەبی وەك قۆنــاغ، بــە تایبــەتی دوای

گەشەکردنی بەڵگەنامە و دەسگاکانی، چوار چێوەیەکە بۆ کـامڵبوونی ئـەو جـۆرە پەیوەندییـە تـا ئەگاتـە یەکێتییـەکی عـەرەبی لـە شـێوازی ئـەو یەکێتییانەی لە شوێنەکانی تری جیهان دروست بووە، ئەشێ ئەو یەکێتییـە لە نێوان کۆمەڵێك وڵاتدا یا هەندێکیاندا دروسـت ببێـت، وەك قۆنـاغێکی پێش دروستبوونی یەکێتییەکی گشتی لە نێوان هەموویانـدا، کـارکردن بـۆ ڕەخسـاندنی جـۆرێکی پێشـکەوتوو لـە ڕێکخسـتنی نێـوان دەوڵەتـە عەرەبییەکان لەسەر ئاستی حکومەتـەکان، و لەسـەر ئاسـتی دەسـگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەرکێکی مێژووییە و شایەنی ئەوەیە ببێتە بەرنامـەی هێزە دیموکراتخوازەکان، و بە تایبەتی چەپەکان کە بە نیازی گۆڕانکارییـەکی دیموکراتیانەن لە وڵاتەکانماندا، پێکهێنـانی بـازاڕێکی عـەرەبی هاوبەشـیش ئەگەر وردە وردەش بێـت، هۆکارێکـە بـۆ دروسـتبوون و کـامڵبوونی ئـەو یەکێتیە و دەستەبەری پێشکەوتن و ترۆقی کردن ئـەکات، بـەڵام گـرنکترین مەرجەکانی بەدەستهێنانی ئەو کامڵبوونـە لـە نیـوان وڵاتـە عەرەبیەکانـدا ئەوەیـە کـە پێویسـتە ڕزگاریـان ببێـت لـە ڕژێمـە سـەرکوتکارەکان، کـە سەرکردەکانیان بیر لە هیچ ناکەنەوە لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیـان نـەبێت لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشتی وڵاتەکانیان .

دۆزی نۆزدەیەم :بریتییـە لـە پەیوەنـدی ووڵاتـەکانی ئێمـە بـە وڵاتـانی جیهانەوە، وڵاتانی ئێمە بە هیچ شـێوەیەك ناکرێـت بەشـێکی دابـڕاوبن لـە جیهان، ناشتوانن هەرپەیوەندییان بە وڵاتانی ناوچەکەوە هەبێت، پەیوەندییە هەرێمایەتییەکان زۆر ئاڵۆزن، بارودۆخی ئەمڕۆش ئەوەی سەلماندوە، ئاساییە هێزە چەپەکان و هێزە دیموکراتیەکان هەڵوێستی خۆیان هەبێت دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانەی ئەمڕۆ لـە جیهانـدا ڕوو ئەدات،هـەروەها پێویسـتە چـەپ هەڵوێسـتی هـەبێت دەربـارەی ئـەو سیاسـەتی دەسـتێوەردانەی ئـەمریکا

ئـەیکات لـە ئیشـوکاری نـاوخۆی ولاتەکانمانـدا، تـا ئـەوەی دەسـتدرێژی سەربازییش ڕاستەوخۆ ئەکات وەك ئەوەی کە لە عێراقدا کـردی، هـەروەها هاوکـاری دوژمنـە ئیسـرائیلییەکانمان ئـەکات دژی گـەلی فەلەسـتینی و نەهێشـتنی بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی فەلەسـتینی سـەربەخۆ، و بەردەوامبوونی لە داگیرکردنی بەرزاییەکانی جۆلان وداگیرکردنی مـەزراکانی گـەلی لوبنـانی و بـەدیلگرتنی هـەزارەها عـەرەب و فەلەسـتینی لـە بەندیخانەکانیـدا، هـەروەها پێویسـە لەسـەر چـەپەکان و هێـزە دیموکراتخوازەکانیش کە گرنگی بدەن بە بەرەنگاربونەوەی سەرمایەی گلۆبـاڵ بەو شـێوە دڕندانەیـە و هـەوڵ بـدەن گلۆبـاڵێکی مرۆڤانـە و دیموکراتییانـە شوێنی بگرێتەوە، بە لەبەرچـاوگرتنی ئـەوەی کـە جیهـان بـەرەو یـەکبوون ئـەڕوات، شارسـتانیەتێکی جیهـانی یـەکگرتو بەرێوەیـە بـە شـێوەیەکی بابەتیانە، ئەم دوو ڕووانگەیە وا ئـەخوازێت لـە چـەپەکان کـە بـە هـەموو توانایان هەوڵ بدەن بەرەو ئەوە بچن پەیوەندی و گونجانیـان لەگـەڵ گـەلانی تردا توند و تۆڵ بێت، لـە ڕێگـەی تێکـەڵبوونی ڕۆشـنبیری و مەرجـەکانی ئاشتی لە جیهاندا، بۆ دابینکردنی مافی گەلان و مافی چارەی خـۆ نوسـین بە شێوەیەکی سەربەستانە، ئەمەش تەنها ڕێگەیـە بـۆ بـەدیهاتنی خـەونی مرۆڤایەتی، هەر ئەوەش ئـەو ئامانجـە بـوو کـە نەتـەوە یـەکگرتوەکان لـە پێناویدا دامەزرا لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ، ئەوەش ئەکەوێتە ناو ڕۆڵی ئەوانەوە کە وەك ئەرکێك ڕێگـە لـە ولاتـە زلهێزەکـان بگـرن دەست نەخەنە کاروبـاری نـاوخۆی ولاتـە بچـوکەکانەوە و هاوکـاری ولاتـە تـازە پێگەشتوەکان بکەن لە حەلکردنی کێشە ئابووری و کۆمەلایەتیەکانیانـدا و بە باشی کاربکەن بۆ نەهێشتنی ناکۆکی نێوان ولاتان و دابینکردنـی مـافی گەلان و مافی چارەی خۆنوسـینیان بـە سەربەسـتی،ئەمەش ئەبێتـە هـۆی

نەهێشتنی ڕۆڵی ڕووخێنەری بزوتنەوە توندڕەوکان کە ناوی ئیرهابیان لێنراوە، لە هەموو حاڵەتێکدا ئەبێت هێزی چەپ هەڵوێستی توند وەربگرێت دەربارەی کۆنەپارێزی و ئسولیەت، کە بەناوی ئاینەوە دژی بەهاکانن و لەژێر ناوی بەرەنگاربونەوەی سەرمایەداریی گلۆباڵدا بە شێوەیەکی دڕندانە و ڕێکخراو ژیانی مرۆڤ وێران ئەکەن، ئەم کردارە وێرانکارییەی ئەو سەلەفی و ئسولیانە کە بە جۆرەها شێواز پێی هەڵئەسن، ئەوە ئەداتە دەست هێزە دەرەکییەکان کە مادام هێزە سەلەفی و ئسولییەکان دژیانن و بەرەنگاریان بوونەتەوە لە وڵاتەکانی ئێمەدا، کە ئەوانیش دەستبکێشنە کاروباری ناوخۆی وڵاتەکانی ئێمە بە شێوەیەکی دڕندانە،ئەوەش پێویستە لەسەر چەپەکان کە وریای ئەوەبن هەڵنەخلیسکێنە داوی ئەوەی کە بکەونە شوێن ئەو درووشمانەی کە هەستی گشتی خەڵك ڕازیبکات کە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ بەرنامە بەرزکراوەتەوە، وەك ئەو درووشمانەی کە ڕێك پێچەوانەکەی بەدیدێت، سەلمێنەری ئەم ڕایەشمان زۆر ڕوون و ئاشکرایە و نموونە لەبەردەستدایە وەك ئەو هێزە تەکفیری و سەلەفیانەی ئێستای بن لادن و قاعدە، هەموو ئەو هێزانە وایکردوە کە خەڵکانێکی زۆر بە عاتفە شوێنیان بکەوێت و وەك غەریزە وبێهودە بونەتە هۆی دروستکردنی ئاژاوە و گێرەشێوێنی لە وڵاتەکانماندا، پێویستە لەسەر چەپ بزانن کامە ڕێگەی ڕاست و دروست و مرۆڤانەیە بۆ پێکهێنانی گلۆبالیزم و کامە ڕێگەی ڕووخێنەری مرۆڤایەتی و هەسارەی زەوی و دەورو بەرێتی لە گلۆباڵی سەرمایەداریدا، هەروەها پێویستە لەسەر چەپ بچێتە ناو ئەو جولانەوە جیهانیانەوە کە بەرەو دروستکردن و بەرەو پێشبردنی یەکێتییەکی جیهانیی ئەڕوات بۆ بەدیهێنانی گلۆباڵێکی جیاتر،

گلۆبـالێکی مرۆڤانـه وەك ئـەوەی لـه دوو سـەدەی رابـردوودا لـه شـێوازی نێودەوڵەتیدا بەدیمان کرد،

دۆزی بیستەم : پەیوەسته بە گۆڕانکاری لە جیهانی عەرەبیدا بە هـەموو پێکهاتەکانیـەوە و بـە هـەموو شـێوازەکانی هاوکـاری نێوانیانـەوە و بـۆ پێکهێنانی بەرنامەیەکی هاوبەش، کە پشتگیری بکـات لـە سـەربەخۆیی و سـەروەری وڵاتـە عەرەبیـەکان، چ وەك تـاك و چ بـە کۆمـەڵ، هـەروەها پەیوەندییەکی عەرەبی پێکبهێنێت کە لە خزمەتی پێشخسـتنی ئـابووری و کۆمەڵایەتیدا بێت و لە خزمەتی سەربەخۆیی گەلەکانیاندا بێـت سـوود لـە رابردوو وەربگرێت بە چاك و خراپییەوە.

ئەمە هەنـدێك بـوو لـەو دۆزانـەی کـە مـن بەسـەرەکیم زانیـون و وەك پرۆژەیەکی تازەی هەڵسانەوەی چەپ پێشکەشم کـردوون، ئـەم پرۆژەیـەش تـەواو کامـڵ نابێـت بـەبێ گفتوگـۆو سـاغکردنەوەی لەسـەربنەمایەکی دیموکراتیانەو پشت بەستوو بە واقیعەوە، هەموو هێـزە چـەپەکانی جیهـانی عەرەبی هێزێکی گەورە و خاوەن دەسەڵات پێـك ئـەهێنن لـە نێـوان بەشـە شەعبییەکەدا و لەناو رۆشنبیران و لاواندا، بەڵام هێزێکـی رێکنـەخراوون لـە چوارچێوەی حزبێکدا، بەڵکو زوربەشیان دوورن لە حزبایەتییەوە چ چـەپەکان و چ راسترەوەکان،ئەم هێزە پەرت و بڵاوانە لە چاوەڕوانی رێکخستنێکدان بە پرۆگرامێکی راست تا پێشڕەوایەتی بکـرێن بـەرەو پاشـەڕۆژ، کـە مـن وای ئـەبینم ئەمـە ئـەرکی چـەپە کـە ئـەم رێکخسـتنە و ئـەم پێشـڕەوایەتییە بکات،کە خاوەنی پڕۆژەیەکی نوێ بێت بۆ گۆڕان، بەڵام ئـەو چـەپە کـە بـە ڕەوتە جیاوازەکانیەوە لەدایك ئەبێت بە تەنها نییە لەو جەنگە مێژووییـەدا، بەڵکو پێویستە یەك بگرێت لەگەڵ هەموو ئەو هێزانەدا کە لەگەڵیاندا یـەك ئامانجن، لە هەموو حاڵەتێکدا چەپی نوێ ئەبێت بە شێوازێکی نـوێ خـۆی

ڕێکبخات کە جیاواز بێت لە حزبە کۆنەکان، هەڵەیەکی گەورەشە کە سوود وەرنەگیرێت لە ئەزموونی ڕابردوو بە چاك و خراپیەوە، ئەوەشی پێویستە بوبێتە دەرئەنجامی ئەو گونجانە لەگەڵ مەرجەکانی سەردەمدا کە بیگەیەنێتە شێوازێك یا چەند شێوازیك بۆ دروستبوونی چەپێکی نوێ، کە ئەو چەپەش ئامادەیە دروشمی ئەو دۆزانە هەڵگرێت کە بەرنامەی گۆڕان پێك ئەهێنن لە وڵاتانی ئێمەدا، بەرنامەیەك کە سنووری جیاوازی هەیە و بۆ هەر وڵاتێکیش بە پێی مەرجەکانی ئەو وڵاتە جیاوازە لە وڵاتێکی تر، بەڵام ئەم جیاوازییە شورای چینی درووست نەکردوە لە نێوان مەرجەکانیاندا لەسەر ئاستی عەرەبی، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەپ پێویستە بگەڕێت بە شوێن شێوازی ڕێکخستن و پێکهاتن لە نێوانیاندا، دەربارەی ئەوەی کە هاوبەشن تیایدا و کە وای ئەبینێ ئەرك و دۆزێکن گرنگن بۆ هەموو وڵاتەکانمان .

## بە دواداچوون

# پێویستی بوونی چەپێکی نوێ و پێویستی بوونی بەرنامەیەکی گونجاو و هەنوکەیی بۆ گۆڕان

کتێبەکەم (بەرەو هەستانەوەیەکی سەرلەنوێی چەپ) کە لە (دار الساقی) چاپکراوە لە بێروت، گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر کرا، لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە چەپە ڕۆشنبیرە عەرەبەکانەوە لە لوبنان و میسر و فەلەستین وتونس و سوریاو عێراق کە ژمارەیان گەیشتە (٣٧) کەس، ئەم گفتوگۆ و بیروڕایانەش لە کتێبێکدا کۆکرایەوە لە لایەن مەڵبەندی لێکۆلینەوەی عەرەبیی و ئەفریقیەوە (مرکز البحوث العربیة الأفریقیة)کە چاپکراوە لە لایەن (مکتبە جزیره الورد) لە میسر بە ناونیشانی (حوارات مع اطروحات کریم مروة نحو نهوض جدید للیسار فی العالم العربی) هەر لە هەمان کتێبدا بەدوادا چونێکی منی تیایە لەسەر بیروڕاکانی ئەوان وا لێرەدا کورتەیەکی ئەخەمە بەردەستی خوینەران .

لەو گفتوگۆیەدا لە گەل هاورێ ڕۆشنبیرە عەرەبە چەپەکاندا،دەربارەی هەلۆێستی من و بیروڕای من لە کتێبەکەمدا، ویستوومە بلێم وپێداگریشی لەسەر ئەکەمەوە کە بیروڕا دەربارەی هەستانەوەی سەرلەنوێی چەپ تەنها هەولێکە نەك بڕیارێکی کۆتایی، ئەوەش بەخۆم ڕانابینم وەك فەرمانیك یا شتێکی لەوجۆرە بڕیار بدەم، من لەبەر ڕۆشناییی ئەزموونی دورو درێژی

خۆم لە ئاستی بەرپرسیارێتی لە ناوەندی چەپدا لە ولاَتەکەی خۆم لوبنان، هەروەها لەپەیوەندی زۆری خۆم بە هەموو شێوازەکان و بۆنەکان لە گەلّ چەپەکانی تری ولاَتانی جیهاندا، جگە لە ویست و ئارەزوی خۆم بۆ تازەبونەوەی بیروڕای چەپ و پرۆگرامی چەپ وشێوازی ئیشکردنی لەم وولاَتانەی ئێمەدا و تا هەستێتەوەو ڕۆلّی خۆی ببینیّ، پێش ئەوەی مالّئاوایی لە ژیان بکەم کە ئێستا تەمەنم نزیکی هەشتا سالّە .

ئەو گفتوگۆو لەسەردوانانە کۆمەلّێك بابەتی گرنگی ورژاندوە، ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندی بە ئێستای وولاَتی ئێمەوە هەیە و پێویستی بەوە هەیە کە چەپ دەنگ و ڕۆلّی خۆی تیا هەبێت، ناتوانم بچمە قولاَیی لێکۆلّینەکانەوە پێش ئەوەی بلّێم تێبینی ئەوەم کردوە کە ئەو برە زۆرە گرنگی پێدانەی کە بە پاشەڕۆژی بیروباوەڕی چەپ دراوە هێشتا نەیخستوینەتە سەر ڕێگەی ئەو پاشەڕۆژە کە چەپ تیایا ئامادە بێت لەگەلّ پەیوەست بوونی بە مەرجەکانی سەردەمەوە وبە پێویستی ئەو ڕۆلّەی کە ئەبیّ بیبینیّ لە بزوتنەوەیەکدا بۆ ئەو گۆڕینەی کە ولاَتەکانمان چاویان تیّ بڕیوە بۆ ڕزگاربوون لە هەموو ئەو نەهامەتیە هەمەجۆر و هەمە سەرچاوەیەدا، کە ئەمەش شوێنی دلّەڕاوکێیە، ئەگەر چەپیش پاشەکشەی کرد بە هەرشێوازێك بێت و پەراویز کەوت لە بینینی ڕۆلّی خۆی، ئەوا هاوبەش ئەبێت لە وەی کە گەلەکانمان ببنە قوربانی لەبەردەمی سیّ کاری ترسناکا لە سەر ژیانیان :

جۆری یەکەم / دەسەلاَتێکی سەرکوتکار کە ڕۆلّی حکومەت و دەسگاکانی پەکخستوە بەجۆریّ کە کۆمەلگای بەرەو دواوە بردوە و زولّم و زۆری گەیاندۆتە ئەوپەڕی، و دەرگای والاَکردوە لەبەردەم دەستکێشانە

ناوەوەی ولاّتانی دەرەوە لە هەموو ڕوویەکەوە و خزمــەتی بەرژەوەندیــەکانی ئەوان ئەکات .

جۆری دووەم /ئەو سەرکوتکردنەیە لە کۆمەڵگادا کە دەسەلاّتی ئاینی بە شێوازی جۆراو جۆر ئەیسەپێنیّ، لە ڕێگەی ژێردەستخستنی ئەقڵ و هەستی زۆر لەو کەسانەی کە تووشــی نائومێــدی بــوون دەربــارەی گۆڕانکــاری لــە ژیاندا، ئەم نائومێدیــەی ئەمانــەش لــەوەوە سەرچــاوەی گرتــووە کــە چــیتر باوەڕیان بە جولاّنەوەی چەپ نەماوە بۆ گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا بــە هــۆی پەناگیری چەپ و پەراوێزکراوی چەپ .

جۆری سێیەم/ لە شێوەی سەرمایەی تەماعکارو گلۆباڵیزم خۆی ئەنوێنیّ لە شێوازی دەوڵەت و دامەزراوەی جۆراوجۆری پیشەسازی و داراییــدا، کــە بە بیّ پەروا دەست ئەکێشێتە ئیش وکارەکانمانەوە و بڕیــاردەری پاشــەڕۆژی ولاّتەکانمان و گەلەکانمانە بە تاك و بە کۆ .

لێرەدا ڕێگە بەخۆم ئەدەم کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە نەهامــەتی چــەپ لە ولاّتانی ئێمە و هەموو جیهاندا،کە لە پاشەکشەو پەراویزکەوتنــدا خــۆی ئەبینێتەوە، هۆکارەکەی خۆیی و بابەتیــە، هۆکــارە بابەتیــەکان بــریتین لــە خراپی دروستبوونی ئەزموونی سۆشیالستی هەر لەســەرەتاوە و وای لێکــرد کە شکست بهێنیّ لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەی کــە وایــان پیشــان ئــەدا ڕێڕەوی مارکسیان گرتۆتەبەر بۆ گۆڕینی جیهان بە نــاوی سۆشیالســتییەوە، بێگومان ئەوشکستیە ڕویدا کە بینیمان دوای سیّ چارەك سەدە دروست بوو بــوە هــۆی زینەبەچــاڵ کردنــی خــەونی ملیۆنــەها هــەزارانی جیهــان،و نائارامییەکی وای خولقاند کە بیّ وێنەبێت لە هەســت و فکــری مرۆڤــدا چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ بە چەپەکان و ڕۆشنبیرانیشەوە.

ئاسایی بوو کە ئەو هەرەسە لـە کـاتی خۆیـا بۆشـاییەکی گـەورەی لـە جولاّنەوەی سیاسی و کۆمەلاّیەتیدا دروستکرد و سەرمایەدارییش بـە پەلـە هەولّی دڕندانە و زۆردارانەیدا بە هەموو شێوەکان بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلەو لە پێناوی کەلّەکە کردنی زیاتری قازانجدا بۆ خـۆی، هـەروەها هاوکـار بـوو لەوەی جوولاّنەوە ئاینیەکان بتوانن دەست بگرن بەسەر هەست و بیروبـاوەڕی ئەو ناوەندە گەورەیەی کە توشی داچوون و نائومێدی بوبوو لە ئەنجامی ئـەو کارەساتەوە، بەلاّم هۆکارە خۆییەکان بریتییە لە نەتوانینی چەپ لە جیهاندا بەولاّتەکانی ئێمەشەوە کـە بـە ئـەزموونی سۆشیالسـتیدا بچـێتەوە، دوای ڕوخـانی وبــە تێڕوانینێکـی ڕەخنەگرانــە تیشـك بخاتــە ســەر هۆکـارە ڕاستەقینەکانی شکست و هەرەسێك کە لە زەوی لەرزەیەك ئەچوو، هەروەها لەگەلّ ئەوەشا چەپ نەیتوانی بیروباوەڕی خۆی تـازە بکاتــەوە و ســەرلەنوێ دایرێژێتەوە وشێوازی نوێی خەبات بگرێتەبەر، چونکە نـەیتوانی دەرس لـەو هەلاّنە وەربگرێت لە ڕێگەی ئەزموونی خۆیەوە و هەلّەکانی چـاك بکـات و ڕاستەکانیشی پەرە پێبدا، بۆیە ئەم دوو هۆکارە بەردەوام لەگەلّیا مایـەوە و یەك تەواوکەری ئەوی تر بوو .

ڕووخان وهەرەسی ئەو ئەزموونە و دروستبوونی ئەوسڕبوونە لە مێشك و هەستی مرۆڤدا و ئەو ئالّۆزییە لە بیرکردنەوەدا وای کرد چەپ دوابکەوێت لەو پیاچـونەوە ڕەخنەییــەدا بۆگــەڕان بــە دوای هۆکـارە ڕاســتەقینەکاندا و وایکرد کە جولاّنەوەی چەپ لە ولاّتانی ئێمەو جیهانیشدا قورس بێـت بـۆی کە بتوانێ لەو نەهامەتیە ڕزگاری ببێت و بڕوانێتە ئێستاو پاشەڕۆژ .

لەم پێشەکییە کورتەدا بۆ پیاچوونەوە،مەبەستم ئەوە بوو کـە ئاشـکرای بکەم کە نەهامەتی چەپ لە ولاّتی ئێمەدا بەشێکە لە نەهامەتی چـەپ لـە هەموو جیهاندا، ئەمەش ئەوەناگەیەنێ کە من دەرگای گفتوگۆم داخسـتبێ

و هەموو كتێبەكانم شایەتی ئەوەن كە ئـەوە كـاری مـن نییـە و دوورە لـە منەوە، هیواداریشم گفتوگۆ و لێكۆلینەوە لەسەر بیروبـاوەڕ و بۆچـونەكانی من هاریكاریەك بێت بۆ دەربازبوونی چەپ لەو نەهامەتیەی كـە تیایـەتی، تا وردەوردە بتوانێ جێی خۆی بكاتەوە و زیاتر پەیوەست بێـت بـە واقیـع و زیاتر توانای وەرگرتنی مەرجـەكانی سـەردەمی هـەبێت وبتـوانێ ڕۆلێكـی كاریگەر ببینێ وەك چـاوەڕوانی لـێ ئـەكرێت . مـن ئەمـەوێ ئـەوە ڕوون بكەمەوە بۆ ئـەو هاوڕێیانـەم كەشـەرفمەندیان كـردم بـە گرنگیـدانیان بـە كتێبەكەم و بە وردی سەرنجەكانیانم خوێندەوە، لە ئەنجامدا سـێ تێبینـیم لا دروست بو كە ئەمانەیە:

تێبینی یەكەم/ هەندێك لەوانەی كە سەرنجیان دەربڕیوە لەوە ئەچێ هـەر ئەوبەشەیان خوێندبێتەوە كە پەیوەستە بە هەستانەوەی چەپ،لەوەش ئەچـێ دەقەكانیان نەخوێندبێتەوە، چونكە ئەوەندەی لە پێشینەی بیروبـاوەڕی مـن دواون وەك بیزانن یابیستبێتیان ئەوەندە خۆیـان لەقـەرەی دەقەكـە نـەداوە، واتە پێشینەیەكیان بۆ گفتوگۆكەیان هەبووە دەربارەی من، ئـەوەش لـەوەوە سەرچاوەی گرتوە كە دوو چارەكە سەدە لەمەوبەر من ئەوەم ئاشـكرا كـردوە كە لە هەندێك بیركردنەوەی ئێستاما جیاوازم لەگـەڵ ڕابردومـدا، بێئـەوەی واز لە چەپڕەوی بهێنم، ئێستاش هەر هەوڵی ئەوە ئەدەم كە پەیوەستی خـۆم بە چەپەوە نوێبكەمەوە، تا زیـاتر پەیوەنـدیم بـە سـەردەمەكەی خۆمـەوە هەبێت و زیاتر لەگەڵ بیروباوەڕی چەپدا یەك بگرمەوە، ئەمەش نـەك تـەنها هەر مافێكی خۆمە بەڵكو ئەركی سەرشانیشمە، چ وەك مرۆڤێك كە مـافی سەربەستی بیركردنەوەم هەیە و چ وەك چـەپێكیش، هەرئەمەشـم دەربڕیـوە لەم كتێبەمداو لە كتێبەكانی پێشوشمدا، سەرەتای ئـەو كتێبانـەش كتێبـی (الحوارات) بو لە سەرەتای ١٩٩٠دا كە هەندێك لەو بیروباوەڕە نوێیانـەمی

تیابوو و چل نوسەری ڕۆشنبیری عەرەبیش هاوکاری گفتوگۆکانیان کردبوو، ئاشکراشە من لەم بیروباوەڕە نوێیانەمدا کە هەوڵ ئەدەم پەرەیان پێبدەم، جیاواز ئەبم لە گەڵ زۆر لە کەسانی چەپی وڵاتەکەم، تەنانەت لەگەڵ هەندێك لە بیروباوەڕەکانی مارکسیشدا جیاوازم، بە تایبەتی ئەو بیروباوەڕانەی کە لەگەڵ ئەوەشدا کە گرنگیەکی مێژووییان هەیە بەڵام لەگەڵ بەرەوپێش چوونی زەمان و کاتدا بە هۆی گۆڕانی هەندێك مەرج و بارودۆخی مێژوویی،ئەوانیش بەهای خۆیان بۆ ئەم سەردەمە لەدەستداوە، ئەم جیاوازیەش ئاساییە کە هەندێك لەو بیروباوەڕانەی مارکس بەهای خۆی لەدەستدابێت چوونکە هەموو بیروباوەڕێك زادەی سەردەمە مێژوییەکەی خۆیەتی، خاوەن بیروباوەڕە زانستیەکان پێغەمبەریان درووست نەکردوە، کتێبەکانیشیان کتێبی پیرۆز نین، مارکس خۆشی بە ڕەهایی ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە بە دۆگماییی و عەقیدەیی سەیری بیروباوەڕەکانی بکرێت، زۆر لە زانا دیارەکانی بواری ئاینیش لەگەڵ ئەوەشا کە دەقەکان بە پیرۆز ئەزانن بەڵام نکولی لەوە ناکەن کە بیروباوەڕەکان پەیوەستن بە سەردەمێکی مێژووییەوە، لەگەڵ ئەم یەکەم تێبینیەشدا دەربارەی خوێندنەوەی ئەوان بۆ بیروباوەڕی خۆم بڕیارمدا شوێن ڕونکردنەوەکانیان بکەوم و قسەی خۆمیان لەسەر بکەم بەبێ ئەوەی بیانرەنجێنم و بێ گوێدانە پێشینەی بیروڕام لەسەریان و جیاوازیش لە بیروڕادا درووستە و مافێکی پیرۆزیشە لەلای من تەنانەت ئەگەر جیاوازیشبین

تێبینی دووەم/ تێبینی دووەمم ئەوەیە کە هەندێك لەو گفتوگۆیانە بریندارکەر بوون، و وەك ئەوە وایە کە لێپێچینەوەم لەگەڵ بکرێت یان تاوانبارێکبم لەبەردەمی دادوەرێکدا، کە ئەمجۆرە گفتوگۆیە نە باوە و نە ئاستی گفتوگۆی نێوان چەپە، بە تایبەتی ئەگەر لەوانەبن کە بەدوای

ڕێگاچارەیەکی کێشەی چەپدا بگەڕێن، پێویستە خەڵکانی چەپ بە دوای ڕاستیدا بگەڕێن، ئەگەر کەسێك خۆی بە فەرمانڕەوایەك وەدادوەرێك بزانێ، ئەوە بێگومان هەڵەیە تا ئاستی سەرکۆنەکردن، ئەو زەمانە بەسەرچوو کە هەندێك وایان ئەزانی مارکسیەکان ڕێپێدراون و ئەو مافەیان هەیە بە ناوی مارکسەوە قسە بکەن و بەرگری لە بیروباوەڕەکانی بکەن و خەڵك بە لادەر ناوببەن، ئەو سەردەمە ڕۆشت و ناگەڕێتەوە، وێڕای ئەو تێبینیانەم لە سەریان بڕیارم داوە کە بیر و بۆچونەکانیان هەڵسەنگێنم بێ ئەوەی ببمە هۆی ڕەنجاندنیان

تیبینی سێیەم / ژمارەیەکی کەم لەوانەی کە سەرنجیان هەبووە لە سەر کتێبەکەم،لەوە ئەچێت هەموو بەشەکانی کتێبەکەیان بەتەواوەتی نەخوێندبێتەوە،بە تایبەتی پێشەکی و دوو بەشەکەی دوایی، ئەمەش کێشە دروست ئەکات، بە تایبەتی بۆ کەسێك کە بیەوێ باری سەرنج لەسەر بابەتێك دەربڕێ و گفتوگۆی لەبارەوە بکات،ئەوبەشەی کەبەسەر ئامادەبوانی کۆڕەکەی قاهیرەدا دابەشکرا، دەربارەی خوێندنەوەی من بۆ هەستانەوەی چەپ، پێشەکیەکی لەگەڵدا بوو کە ئەوە بەشێکە لە کتێبەکە و بۆچونەکانم، کە تیایا سەرنجی خۆمم پێشکەش کردبوو دەربارەی ڕێڕەوی جولانەوەی شۆڕشگێڕی لە سەرەتای مێژووەوە، هەروەها ئاماژەم بۆ شکست و سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشانە کردبوو پەنجەشم بۆ هۆکارەکانی ئەو سەرنەکەوتنانە درێژ کردبوو، دوای ئەوە بەشێك هەیە باس لە ڕووخانی ئەزموونی سۆشیالستی ئەکات، لەگەڵ سەردەستەیی سەرمایەی جیهانگیر بە شێوازی کۆن و تازەش، ئەمەش لە خۆیا خوێندنەوەیەکی سەرەتاییە بۆ هاوکاری کردن لە گفتوگۆیەکدا دەربارەی سیمای سەردەمەکە، کە هەوڵێکی دەستەجەمعی ئەوێت بۆ دیاریکردنی بە شێوەیەکی ورد و

بابەتیانە، لەبەر ئەوەی ئەونەهامەتیەی ئێستا سەرمایەداری تێکـەوتوە بـێ وینەیە و هەر لە گەورەبوندایـە بـە شـێوەیەك کـە ڕژێمـی سـەرمایەداریی نـاتوانێ ڕێگەچـارەیەك بدۆزێتـەوە بـۆ وەسـتانی ئـەو نەهامەتییـە و بەربەستکردن و ڕزگاربوون لێی .

لەگەڵ ئەم سێ تێبینیەشدا ئـەوە ناشـارمەوە کـە دڵخۆشـم بـەوەی کـە برێکی دیار و جیاواز لە هەڵگرانی بیروباوەڕی چەپ لە وڵاتەکەمانـدا هەیـە گرنگی بـە پاشـەڕۆژی چـەپ ئـەدەن، وەك لـەو گفتوگۆیانـەدا دەرکـەوتوە دەربارەی کتێبەکەی من، ڕێزی تایبەتیم هەیە بۆیان و بۆ بیروڕاکانیـان وبـە هەند وەریئەگرم، مافی خۆیانە لەگەڵما بن یا دژم بن لە هەندێك حاڵەتدا .

ئەوەی بەدەستم هێناوە لە خوێندنەوەمدا بۆ بـاری سـەرنجەکانی ئـەوان، ئەوەیە کە گفتوگۆکانیان لەم تەوەرانەی خوارەوەدا خۆی ئەگرێتەوە

١-دەربارەی پیاچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانە بۆ ئەزموونی چەپ، پەیوەست بە هەرەسی ئەزموونی سۆشیالستی، پێش ڕوخان و دوای ڕوخان

٢-دەربارەی تێگەشتن لـە چـەپ لـە جیهـانی سـەردەمدا، پێناسـەی و چۆنیەتی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی بیروباوەریان و ڕۆڵیان و پەیوەندیان بـە هەستانەوەی .

٣- دەربارەی جۆری ئەرکەکانی چەپ لەم سەردە مێژوییەدا لـە وولاتـی ئێمەو وولاتانی جیهاندا، قۆناغی تێکۆشانی و گرنگیەکانی هـەر قۆناغێـك لە قۆناغەکان و لە کام قۆناغەدا تێکۆشانەکەی بەرهەم دێت .

٤- دەربارەی تێگەشتن لە دەوڵەت و ئەو ڕۆڵەی کە لە جیهانی ئـەمڕۆدا هەیەتی، کام دەوڵەتە و چۆن دەوڵـەتێکمان ئـەوێت وئەرکـەکانی چـییە و، چی لەو ئەرکانە گرنگن بۆ ئەمڕۆ .؟

٥- دەربارەی ووشەی عەرەبی کە پەیوەنـدە بـە ناونیشـانی کتێبەکـەوە (چەپ لە ولاٌتانی عەرەبیدا)، (تێبینی : ناونیشانی کتێبەکەی کەریم مـروە لە دەقە عەرەبییەکەدا بەم جۆرەیە : بەرەو هەستانەوەی سەرلەنوێی چەپ لـە جیهـانی عەربیـدا بـەلاّم لـە نامەیەکیـدا بـۆ مـن داوای لێکـردم کـە لەوەرگێرانەکەمدا بەم جۆرە بیت : بەرەو هەسـتانەوەی سـەرلەنوێی چـەپ، واتە لە جیهانی عەرەبی لێبکەمەوە — وەرگێر )

٦- دەربارەی سروشت و جـۆر و ئـامرازی خوێندنـەوە وەك چـەپێك بـۆ رژێمی سەرمایەداریی و جولاٌنەوە و گەشـەکردن و دواتـر نەهامەتیـە یـەك لەدوای یەکەکانی لە سەردەمی جیهانگیری و گلۆبالێزمدا وەك دیاردەیـەکی سەردەم لە جیهانی ئەمرۆدا.

با بە تەوەری یەکەم دەست پێبکەین/ کە پەیوەندی بـە پیاچـونەوەیەکی رەخنەگرانەوە هەیە لەگەڵ مەرجەکانی سەردەمدا، کە پەیوەندی بـە مـن و هەلۆیستی منەوە هەیە، لە راسـتیدا ئـەم پیاچـونەوەیە دوولای هەیـە کـە هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی ترە و پێویستیەکی گرنگـە بـەلای چـەپەکانی ولاٌتەکەمانەوە ، ئەوەی کە پێویستە هاورێیـانم گرنگـی پێبدەن،ئەوبەشـەیە کە پەیوەندی بە ئەزموونی سۆشیالستییەوە هەیە لە یەکێتی سۆڤیت و ئـەو سیستمە جیهانییەی کـە نـاوی سۆشیالسـتی پەیوەسـتکرد بـە چـەپەوە،بە هەموو باڵە جیاوازەکانیەوە لە ناو حزبەکان و لە دەرەوەی دەسەلاٌتیشـدا،جا ئەوپەیوەستییەی ئەو حزبانە پەیوەندی بە ئـەزموونی سـۆڤێتیەوە بێـت یـا چینی، یا بە رێژەیەکی دیاریکراو لێیان جیاواز بێت، لەبەر ئەوە من هـاورام لەگەڵ ئەوانەی کە لایان وایە لەو پیاچونەوە رەخنەییەدا ئەو دوو ئەزموونـە بەیەکەوە گرێبدەین، دەربارەی ئەو تێبینیەش کە وتراوە لەسەرم کـە گوایـە کتێبەکەم رەخنەو رەخنە لەخۆگرتنی تیانیە، ئەمـەوێ ئـەوە بـە هاورێیـانم

بڵێم کەبەشی یەکەم ئەو هەردوو لایەی گرتۆتە خۆی، بەلاّم دیارە ڕەخنەیەکی پەرت و بلاّوبوە و کەم بوە و ڕازیکەر نەبووە، من خۆم دان بەوەدا ئەنێم، بەلاّم لەهەمان کاتدا حەز ئەکەم ئەوە بەبیری هاوڕێکانم بهێنمەوە، من لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە زیاتر لە بیست کتێبم بەچاپ گەیاندوە و تیایاندا ڕەخنەو ڕەخنەی خۆییم گرتوە، بەلاّم سەیر لەوەدایە بەشێکی تری هاوڕێیان کە بەشداری ئەو گفتوگۆیەیان کردوە بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە وای ئەبینن کە ئەو ڕەخنە گرتنەی من زیادەڕۆیی تیابوە و تا سەر ئێسقان داچووە،ئەو هاوڕێیانە ئەوە ئەخەنەوە بەرچاوم کە تاچەند ئەزموونی سۆشیالستی دەسکەوتی کۆمەلاّیەتی هەبووە، هەروەها ئەو هاوڕێیانە ئەوەم یاد ئەخەنەوە کە چەند هێمای گەورە بە ناوی سۆشیالستیەوە لە ولاّتانی ئێمەو ولاّتانی عەرەبی دەرکەوتن، چ لە ئەدەب و چ لە هونەرو،چ لە فکرو زانستدا و شوێن پەنجەیان بە سەردەمەکەوە دیار بووە، لە هەمان کاتدا کە ڕێزی ئەو تێبینیانە ئەگرم کە دەریانبڕیوە، دانیش بەوەدا ئەنێم کە لە کتێبەکەمدا لەو ڕووەوە کەم وکورتی هەیە، لە بەرانبەری ئەوەشدا لەوە ئەترسم ئەوەندە بەو دەستکەوتانەدا هەڵبدەین و کەم و کورتیەکان و ڕەخنەکان لە یاد بکەین کە لە ئەزموونەکەدا هەبووە و ئەو هەلاّنە بکەین بە ژێرەوە کە بوونە هۆی هەرەسی شۆڕشەکە دوای سێ چارەکە سەدە لە هەڵگیرسانی.

گفتوگۆ لەسەر تەوەری دووەم / دەربارەی تێگەشتن لە چەپ و پێناسەی چەپە، کە ئەمە گرنگترین بابەتی گفتوگۆکەیە، چونکە ناکۆکییەکی زۆر هەیە دەربارەی ناوەڕۆکی چەپ لە ناو چەپەکاندا، دەربارەی بیروباوەڕی چەپ، دەربارەی پێناسەی چەپ و ئەرکە هەنوکەییەکانی چەپ و پانتایی جەماوەرەکەی و بەردی بناغەی، لە ڕاستیدا ئەم بەشە لە کتێبەکەی مندا

سەرەکیە کە گفتوگۆیەکی تیۆروتەسەل و قورسم لەسەری کردوە، لەبەر ئەوە لاریم لەوە نیە کە ڕەنگە بۆچونەکانی من شلەژانی پێوە دیار بێت، لاریشم لەوە نیە کە بە ڕاڕا ناوبراوم، مرۆڤی ڕاڕا مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە،وەك یەکێك لە هاوڕێکانم ووتویەتی (فیصل دراج)، مرۆڤ بەردەوام ئەگەڕێ و هەوڵ ئەدات و تاقیکردنەوە ئەنجام ئەدات، بێ ئەوەی ماندوو ببێت یا کۆڵ بدات یا لە ناو وەهما نقوم ببێت، لەبەر ئەوە من دانی پیا ئەنێم کە مرۆڤێکی ڕاڕاو شپرزەم و نوقمم لە ناو هەوڵی گەڕان بەدوای پاشەڕۆژی چەپدا لە وڵاتەکەماندا و وێڵم بەدوای ئەوەی کە ڕۆڵی دیاریکراوی خۆی ببینێ لە گۆڕاندا لە وڵاتەکەمدا، بەڵام تێبینیەکی گشتی لە لام دروست بوە لەو گفتوگۆیانەوە کە دەربارەی هەڵوێستی من وجێ دەستی من کراوە،لە بارەی لێکۆلینەوە لە پاشەڕۆژی چەپ، ئەویش ئەوەیە زۆر لە و گفتوگۆیانە وەك سوڕانەوە وایە لە بازنەیەکی بەتاڵدا، یەك لەوانە ئەوەیە کە هەندێك لە هاوڕێیان تاوانبارم ئەکەن بەوەی کە من لە بزوتنەوەی چەپدا ئاماژەم نەکردووە بە ڕۆڵی گرنگی چینی کرێکار لە گۆڕینی کۆمەڵدا بەو پێیەی کە بەتایبەتی هەڵگری بیروباوەڕی گۆڕانە، هەروەها من لە دیاریکردنی پانتایی جەماوەری چەپی نوێدا ئاماژەم بە مەسەلەی چینایەتی نەکردوە و دژایەتی چینایەتیم پشتگوێ خستوە،ئەمەش تاوانبارکردنێکی ناوردبینانەیە، من ئەپرسم، هیواداریشم لە دەربڕینەکەمدا ڕەق نەبم، ئایا ئەو هاوڕێیانە لە دیاریکردنی چەپ و ڕۆڵی چینی کرێکاردا ئەوگۆڕانکاریە گەورانەیان بە هەند وەرگرتوە کە جیهانی سەردەم بەخۆیەوە بینیوە دوای تێپەڕبونی سەد ساڵ بەسەر کۆچی دوایی مارکسدا ، و تێپەڕبوونی ئەوماوەیە بەسەر بیروباوەڕ و تێگەیشتنی و دیاریکردنی لایەنە دژ بەیەکەکانی کۆمەڵگەی سەردەم ؟ لێرەدا واز لەوەش ئەهێنم کە

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و تەکنیك و زانستەکان چەند کاریگەری هەبووە لەسەر پرۆسەی بەرهەمهێنان و هەروەها کاریگەری لەسەر پەیوەندی نێوان خاوەنەکانی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان وبگرە هەموو بەشە کۆمەڵایەتییەکانی تر لە ئاستە جیاوازەکاندا، مەبەستم بەشە خاوەندارییەکان و ئەوانی تریشە، لە بەر ئەوە قسەکردن بەزۆری لەسەر چینی کرێکار و ڕۆڵی لە دژایەتی چینایەتیدا، بەبێ ئەوەی لە مەسەلەی چینایەتی گەشتبێتی لە سەردەمی نوێدا، بەبێ ڕوانینێکی بابەتیانە بۆ ئەو گۆڕانکاریە گەورانەی بەسەر چینەکان و بەشە کۆمەڵایەتییەکاندا هاتووە لە هەر شوینێکدا، نامانگەیەنێتە تێگەیشتنێکی ڕاست دەربارەی حاڵی وولاتەکەمان،و هیچیشمان دەربارەی باری ئێستای جیهان دەست ناکەوێت، لێرەشدا بە هیچ جۆرێك مەبەستم ئەوەنیە بڵێم کە ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی کە جیهان لە سەدەو نیوێکدا بە خۆیەوە بینیوێتی هیچ ڕۆڵێکی چینی کرێکاری تیا نەبوە و هیچ ئامادەباشییەکی نەبوە وەك تێکۆشان بەناوی چەپەوە و لە پێناوی گۆڕینی جیهاندا، بۆ تەواو کردنی پرۆژەکەی مارکس،بەلاّم ئەمەوێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە دیاریکردنی چینی کرێکار پێویستی بە لێکدانەوەیەکی تر و بەشێوەیەکی وردتر و پەیوەست بە سەردەمەکەوە هەیە، بەلای منەوە وایە بەپێی خوێندنەوەی خۆم بۆ سەردەمەکە و ئەو گۆڕانکاریانەی کە زانست و تەکنەلۆژیا هێناویێتیە کایەوە، تێگەشتن لە چینی کرێکار بەو شێوە کۆنەی مارکس نیە،بەو وردیەو بەو ڕۆڵەی کە بۆی ئەچوین لە ئەدەبیاتی کۆنماندا، ئەوان بەتەنها خاوەنی پرۆژەی گۆڕان نین بەوجۆرەی کە چەپی هاوچەرخ هەوڵی بۆ ئەدات بۆ بەدەستهێنانی لە وولاتانی ئێمە و هەمو ولاتانی جیهاندا، بە پێی بارودۆخی هەر وولاتە و تایبەتمەندیەکانی، سەردەمەکە سەلماندی کە ئەو

بەشە کۆمەلاّیەتیەی ئەچەوسێتەوە و هەولّی ڕزگـاربوون گـۆڕان ئـەدات زۆر لەوە فراوانترە و ئەوانەی بەرژەوەندیان لە گۆڕاندایـە هەمـەجۆرن و فـراوانن، بەرانبەر ئەوەش ئەوانـەی بەرژەوەنـدیان نیـە لـە گۆڕانـداو زەرەرمەنـد ئـەبن بەرتەسـکتر بونەتەوە،دەسـەلاّتگیری گەشـتۆتە ئاسـتێکی دواقۆنـاغ ، ئـەو ڕونکردنەوانـەم ئەمگەیەنێتـە ئـەوەی کـە بلّـێم چـینی کریکـار بـە پێـی تێگەشتنی مارکس، ئەوانەی لە کارگەکان و دامـەزراوە بەرهەمهێنەرەکانـدا بەکرێ کار ئەکەن بە هەمو شێوازەکانیانەوە، ڕۆڵیان کەمبۆتەوە بـە حـوکمی کەمبونەوەی ژمارەیان، بەرانبـەر ئەمـە ئـەوەی ڕەچـاو ئـەکرێت زیـادبونی ژمـارەی بێکـاران و ژمـارەی ئـەو هێـزە جەماوەریەیـە کـە بەرهەلّسـتی سەرمایەداری ئەکەن وهـەولّی گـۆڕان ئـەدەن بـەرەو ئاڕاسـتەی دابینکردنـی یەکسانی کۆمەلاّیەتی بە پێی ویستی مارکس وبە شـیوازێکی چاککراو کـە بگونجێ لەگەلّ سەردەمەکەدا، بەجۆرە پێکهەلپـژانی چـینایەتی بـەو شـێوازە نەماوە کە مارکس بـەوردی دیـاری کـردوە، لـە نێـوان چـینی کرێکـار بـەو وردەکاریە کۆنانەی کە دیاریکردوە لەگەلّ چینی بۆرژوا.

بەلّکو شێوازێکی فراوانتری وەرگرتوە و بووە بە پێکەهلّپژانی دەسـتەیەکی کۆمەلاّیـەتی گـەورە کـە زولّـم و زۆری کۆمەلاّیـەتیان لەسـەرە بەرانبـەر دەستەیەکی سەرمایەداری جیهانگیری گەورە کـە دەسـتیان بەسـەر بەشـێکی گەورەی ساماندا گرتوە و یـاری بـە پاشـەڕۆژی هـەمو گـەلانی سـەرزەویەوە ئەکەن ، ئەمەشی کە ئەیلّێم لـە قەناعـەتێکی زۆری خۆمەوەیـە بـێ ئـەوەی بەلّگە بهێنمەوە، بەلّکو هەولّێکی خۆمە بۆ تێگەیشتن لەو گۆڕانکاریانەی کـە دنیای سەردەم بەخۆیەوە ئەیبینێ لە سەر هەموو ئاستەکان، وەك دیاریکردنی تێگەیشـتن لـە چـەپ و دیـاریکردنی ناسـنامەی و دیـاریکردنی بنکـەی کۆمەلاّیەتی و گرنگییەکان و ئەرکەکانی لە گۆڕینی کۆمەلّگەدا، لەبەر ئەوە

ئەو پەنجەی تاوانەی کە بۆمن درێژکراوە بە شێوازی جیاجیا دەربارەی چۆنیەتی بۆچوونم و تێگەیشتنم لە چەپ، لەو ڕووەشەوە تاوانبارکردنم بە لیبراڵی، بەلای منەوە ئەو گرنگییەی نیە کە ببێتە جێگەی باس و لێکۆلینەوە و مشت ومڕ، دەربارەی گەوهەری ئەو بیروباوەڕانەی من دەربارەی چەپ پێشکەشم کردوە و باسی نوێبونەوەی تێگەیشتن لە چەپم تیا دیاری کردوە، ئەمەش لای من بۆچونێکی دروستکردوە کە هیوادارم وانەبێت و من هەڵەبم، ئەویش ئەوەیە ئەمانە خۆیان هەست بەوە ناکەن کە وەك چەپێك لە نەهامەتییەکا ئەژین کە هەست بەبوونی کیانی خۆیان ناکەن، ئەمانە تەنها گرنگیان بەم مەسەلەیە داوە لە ئاستی جێگەو پێگەو بەرپرسیارێتی خۆیانەوە، و هەرئەوەندەش بە هەوڵدانێکی تیوری و پراکتیکی لەو ئاستەوە هەوڵی خوێندنەوەی ئەو هەرەسانە و ئەو گۆڕانکاریانە ئەدەن لە جیهانی هاوچەرخدا کە بوونەتە نەهامەتی لە ولآتەکانیاندا، ئەم پرۆسەیەش پێشڕەوی ئەکات بۆ گرتنەبەری ڕێگەیەکی ڕاستبینانە بە پێی مەرجەکانی سەردەم و بۆ دەرچوونیان لەو نەهامەتیەی کە تیایدان،بۆ هاوبەشیکردن لە پرۆسەی گۆڕان کە گەلان لە کۆن و نوێدا هەوڵی بۆ ئەدەن وشۆڕشەکانی ئەمڕۆشیان بۆ قاو ئەدەن، ئەم گفتوگۆیە دەربارەی تێگەیشتن لەچەپ ڕامئەکێشی بۆ تەوەرێکی تایبەت بەو ئەرکە گرنگانەی کە لە ئەستۆی چەپە لە وولآتانی ئێمەدا بەتایبەتی لەم ماوە مێژووییەی کە ئێمەی تیا ئەژین کە ئەمەش تەوەری سێیەمە.

تەوەری سێیەم :لە ڕاستیدا باسکردنی چەپ و دیاریکردنی ئەرکەکانی بە بێ گوێدانە شوێن و سەردەمەکەی، گفتوگۆیەکی بۆش و بێ مانا دەرئەچێت، ئەرکێك نییە بلێی ئەمە گشتییەو پەیوەندی بە شوێن و کاتەوە نییە، سەبارەت بە هەر هێزێکی کۆمەلآیەتی و سیاسی بە تایبەت چەپ کە لە

هەموو ئەدەبیاتیا باس لە قۆناغ و قۆناغکاری وئاڵوگۆڕی قۆناغەکان ئەکات و هەوڵ بۆ گۆڕانی قۆناغەکان ئەدات و لە پێناویا تێئەکۆشێت، لەسەر چەپ پێویستە، ئەو چەپەی کە من لە کۆن و نوێشدا هەوڵم داوە ناسنامەی دیاری بکەم و پەیوەندی خۆشمی پێوە دیاری بکەم،پێویستە هەڵگری بیروباوەڕی ئەوپڕۆژەیە بێت کە دروست بێت بۆ ئەو گەل و نیشتمانەی کە پەیوەستە پێوەی وەك ئێستاش و وەك داهاتوش، لەبەر ئەوە کە من لە ڕوانگەی پێویستیەکانی ئێستای وولآتەکەمەوە لە کتێبەکەمدا بیست ئەرکم دیاریکردوە، یەکەم وەك ئەرکی هەنوکەیی چەپ، بەبێ ڕێکخستنی بەپێی کامیان پێش کامیانە، دوەمیش هەر لە ڕوانگەی ئەو ئەرکانەوە ڕۆڵی چەپم دیاری کردوە، سێیەمیش پڕۆژەی چەپ بۆ گۆڕین، ناسنامەکەی لە ڕوانگەی دیاریکردنی ئەو ئەرکە هەستیارانەوە دیاری ئەکرێت کە ڕێگەی پاشەڕۆژی لە بەردەمدا ئەکاتەوە، ئەو بیست خاڵەی لە کتێبەکەمدا وەك ئەرکەکانی چەپ دیاریم کردە و بە بەرژەوەندیە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەم زانیوە، بە چاکسازی دەوڵەت دەستم پێکردوە تا ببێتە دەوڵەتی ماف و یاساو نیشتمانی وپارێزەری دادپەروەری و یەکسانی، لە سایەی ڕژێمێکی دیموکراتی و دوور لە هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە کە لەم وولآتانەی ئێمەدا بۆ ماوەیەکی دور و درێژە پێڕەو ئەکرێت، هەر لەو ڕوانگەیەوە دەربارەی دەوڵەت و ڕژێم و ئەرك و سروشتی، ئەو ٢٠ خاڵە ڕیزبەند کراوە کە هەموویان پەیوەستن بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەوە بە هەمو توێژەکانیەوە بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی کە بەم ٣ مەرجە نەبێت نایەتە دی :

پێشکەوتنی ئابووری لە هەموو بوارەکاندا، یەکسانی لە نێوان خەڵکاندا لە ئەرك و مافدا بەبێ جیاوازی،ئازادی بە هەموو شێوازەکانیەوە، کە بۆ هەموو مرۆڤێك چ وەك تاك و چ بە کۆمەڵ دابینی مافەکانی ئەکات و

کەرامەتی ئـەپارێزێ ومەرجـەکانی گـۆڕانیش دابـین ئـەکات، بـە پێـی ئـەو پرۆگرامەی کە من لەو خالآنەدا دەستنیشانم کـردوە و پێشـنیارم کـردون بـۆ چەپ لەم وولآتانەی خۆماندا، ئەوەم ڕەچاوکردوە کە خۆمان بەدور بگـرین لـە بازدان بە سەر قۆناغەکاندا، وەکتر بلێم بـازدان بەسـەر واقیعـدا، بـۆ ئـەوەی نەمانکاتە بەندی کەوتنەناو خەیاڵ و دواتر وامان لێبیت خۆزگـە بـە ڕابـردوو بخوازین، بە پێی ئەزموونی خۆم کە هەموو درێژایی تەمـەنمی گرتۆتـەوە، لـە ناو حزبی شیوعی لوبنانیدا ،ئەتوانم بلێم هەوڵی ئـەوەمان داوە خوێندنـەوە بـۆ وولآتی خۆمان،لوبنان،و وولآتانی هاوڕێشمان بکەین .

ناکۆکیەك نابینم لە نێوان خەونەکانی خۆمان بۆ گەیشـتن بـەو ئامانجانـەی کە بەرەو سۆشیالستی دیاریمان کردوە و لە نێوان تێکۆشـان بـۆ نوێکردنـەوەی یاسا گشتییەکانی دەوڵەت بۆ ئەوەی بیکەینە دەوڵەتێکی زیاتر دیموکراتی، یا بلێم کاردانەوەیەکی باشتر بۆ مافەکانی کرێکاران و جوتیاران و منالآن و ژنان و گەنجان و ڕۆشنبیران، لە یەکێك لەبەشەکانی کتێبەکەمدا ئاماژەم کردوە بـۆ ڕاپۆرتەکانی سەرکردەی شەهیدمان فرج الله الحلو کە کاتێـك لـە ئەرکـەکانی سەرشانی شیوعییەکان ئەدوێت، بە هیچ جۆرێك تیایدا باسی لە سۆشیالسـتی نەکردوە، بێگومان کە باسی ئەزموونی خۆم و ئەزموونی حزبەکەشـم ئەکـەم مەبەستم ئەوە نیە بلێم ئیمە لە هەڵوێستی سیاسی و فکـری خۆمانـدا دایمـە لەسەر هەق بوین و هیچ هەڵەیـەکی گـەورەمان نـەکردووە، بـە تایبـەتی لـە کتێبەکەمدا (کريم مروة يتذكر فيما يشبه السيرة) باسم لەوە کردوە کە گەورەترین هەڵە ئەوەبووە کە بەشداری شەڕی ناوخۆمان کردووە، یا پەیوەندیمان بەو ولآتە عەرەبیانەوە هەبووە کە حکومەتەکانیان سەرکوتکەری گەلەکانیان بوون و بە تایبـەتی شـیوعییەکانیان چەوسـاندۆتەوە، بـە دڵنیاییـەوە ئـەوەی ئێمـە بەلامانەوە گرنگـە ئەوەیـە کـە ئەرکـە مێژوویـیەکان بـۆ خـەڵکانی چـەپ

دیاریکردنی بنکه کۆمەڵایەتییەکەی چەپە لەسەردەمەکەدا، ئەمە مانای سەردەمیانە و هاوچەرخانە ئەگەیەنێت، هەروەها هەربەمەش ڕۆڵی خۆی دیاری ئەکات وەك چەپ بەرانبەر کێشەی گەل و نیشتمان، ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە وەك چەپێکی قاڵبوو، ئەوەیە کە ناتوانین ناسنامەی فکری چەپ بە شێوەیەکی ڕەها دیاری بکەین (واتە بۆ هەموو سەردەمەکان و کات و شوێنەکان بەدەر لە دراسەکردنی سەردەم و بارە کۆمەڵایەتییەکان هەریەك پێناسەمان هەبێت بۆ دیاریکردنی ئەرك و ناسنامەکەی — وەرگێڕ) بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ڕۆڵی بیروباوەڕ ڕەتبکەینەوە لە دیاریکردنی ڕۆڵی چەپ لە تیکۆشانیا بۆ گۆڕان، بەمەرجێ ئەو بیروباوەرە بە شێوەیەکی چەقبەستو نەبێتە ئایدولۆژیایەکی نەگۆڕ، هەروەها پێویستە لەسەرمان وەك چەپ بە بێ ترس و دوودڵی لە پێگەو ڕۆڵی خۆمان، کە هەندێك کاتی مێژویی هەیە بە شێوەیەکی ناجێگیر و کاتی،هەندێك بەرژەوەند لە نێوان چەپ و ڕاستدا بەریەك ئەکەون بۆ بەدەستهێنانی هەندێك ئەرك، لێرەدا بێگومان مەبەستم لە ڕاست دەسەڵات نیە بەڵکو مەبەستم هێزە کۆمەڵایەتییەکان و سیاسییەکانە لە هەندێك لە وڵاتە عەرەبییەکاندا کە ڕێڕەوێکی لیبرالیان هەیە و تا ڕادەیەك ڕوناکن، لێرەوە قسەکردن دێتە سەر دەوڵەت و ڕۆڵی دەوڵەت کە ئەمەشیان تەوەری چوارەمە

## تەوەری چوارەم :

لە ڕاستیدا سەرم سوڕ ئەمێنیٚ لەوەی کە هەندێك لە هاوڕێیان ڕەخنەی ئەوەم لێئەگرن کە ئەڵێم پێویستە ئەرکەکانی بنیاتنانی دەوڵەتێکی دیموکراتی لە ولاٚتانی ئێمەدا یەکێکە لە ئەرکە سەرەتاییەکانی چەپ، دان بەوەدا ئەنێم کە تێناگەم ڕەخنەگرە چەپەکان چی ئەڵێن دەربارەی دەوڵەت، من بە پێی تێگەیشتنی خۆم کە لە ئەزموونی حزبی وخویندنەوەم بۆ مارکسیەت و مارکسیەتی کلاسیکی و گەورە مارکسیە هاوچەرخەکانەوە وەرمگرتوە کە باس لە دەوڵەت و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەکەن، بە تایبەتی لە سێبەری سەرمایەداریدا، کە تێکۆشانی ئێمە هەولڵدانە بەرەو داهێنانی یاسای نویٚ لە شوێنی یاسا کۆن و کۆنەپەرستیەکان و گۆڕینیان بۆ یاسای دیموکراسییانە کە خزمەتی مرۆڤایەتی بکات و بە تایبەتی خزمەتی چەوساوەکان بکات . وەکتر بڵێین ئێمە بە ئەرکی خۆمانی ئەزانین کە گۆڕانکاریە پێویستەکان لە ئەرکەکانی دەوڵەت و دامودەسگاکانیا ئەنجام بدەین بە شێوەیەك کە زیاتر ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگیرێت و بەرژەوەندی بەشە هەژارەکەی تیا پارێزراو بێت و دادپەروەرانە بێت، ئەوەش ئەزانین کە ئەو گۆڕانکارییانە لە سروشتی چینایەتی دەوڵەت ناگۆڕیٚ و باش ئەزانین کە دەوڵەت دەوڵەتی سەرمایەدارییە و داکۆکی لە بەرژەوەندی سەرمایەداران ئەکات لە سنورێکی دیاریکراودا،و بە تێکۆشان ئەتوانریٚ کە شێوازێکی سەربەخۆ وەربگرێت لەو چینەی کە ئەو نوێنەرایەتی ئەکات، قسەکردنیش لەسەر سەربەخۆیی دەوڵەت بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە کۆمەڵگای فرەچیندا قسەی مارکسە، مادەم وابێت ئەرکی نوێکردنەوەی دەوڵەت و یاساکانی و کارکردن بۆ ڕزگارکردنی لە شێوازی سەرکوتکاری و چەوساندنەوە و زۆرداری پێش هەرکەسێکی تر ئەرکی چەپەکانە، بەم

تێکۆشانە ئەتوانین بگەینە ئەوەی کە سەربەخۆیی دەوڵەت بسەپێنین لە ئەرکەکانیا و جیای بکەینەوە لەو چینەی کە ئەو نوێنەرایەتیان ئەکات،ئەگەر وانیە ئەی چی پێویستە ؟ ئەی ئەبێ چەپ یەکسەر دەوڵەتێکی پرۆلیتاری ڕابگەیەنێ و دەوڵەتی سەرمایەداریی ڕەتبکاتەوە و هەموو هەڵسوکەوتێك لەگەڵ دەوڵەتی سەرمایەداریدا ڕابگرێت تا ئەو دەوڵەتە پرۆلیتاریە دروست ئەکات ؟ لەوە سەیرتر ئەوەیە کە هەندێك لە هاورێیانم وای بۆئەچن کە من باس لە دەوڵەت و نوێکاری و ئاڵوگۆڕ لە ئەرکەکانی دەوڵەتدا ئەکەم و باس لە دورخستنەوەی لە سەرکوتکاری ئەکەم مەبەستم تەنها لە لوبنانە، وەك ئەوەی ئەو کێشەیە لە هەموو ولاٌتانی تری عەرەبیدا جێبەجێ بوبێت و هیچ کێشەیەك نەمابێت ! لە گەڵ ئەوەدا کە لە لوبنان زیاتر لە هەر دەوڵەتێکی تر دیموکراسیەت بەرقەرارە و بەردەوام ئاڵوگۆڕی دەسەلاٌت هەیە و هەڵبژاردن بەردەوامە لە دەسگاکانیا،هەرچەندە لە هەندێك حاڵەتدا ئەو دیموکراتییە شێوێندراوە، سەرنجی هاورێیانم ڕائەکێشم بۆ ئەو شۆڕشانەی کە لە جیهانی عرەبیدا بەرپا بوون و هەمویانی گرتۆتەوە و داوای گۆڕان ئەکەن، گۆڕانی ڕژێمە سەرکوتکارەکان بۆ ڕژێمی دیموکراتی و مەدەنی کە ئەو ئەرك و ڕۆڵە وەربگرێت لە یەك کاتدا خزمەتی گەل و نیشتمان بکات و ڕێزی سەربەستییەکانی تاك و کۆمەڵ بگرێت و مافی مرۆڤ بپارێزێت

باسکردن دەربارەی دەوڵەت ڕامئەکێشێ بۆ تەوەریکی هاوبەش لە نێوان وولاٌتانی ناوچەکەدا کە ئەمەش تەوەری پێنجەمە .

**تەوەری پێنجەم :**

ئەگەر پرسیارێك دروست بوە لای هاوڕێیان دەربارەی بۆچی ئەڵێم (چەپ لە جیهانی عەرەبیدا) و ناڵێم (چەپی عەرەبی) ئەوە پرسیارێکە پەیوەستە بە هەڵوێستی خۆمەوە دەربارەی گەلی عەرەب و نەتەوەی عەرەب، هەندێك بۆ ئەوە چوون کە من هەندێك لە ڕۆڵی ئەمریکاو ئیسرائیلم کەمکردۆتەوە و یارمەتیم داون لەوەی کە زۆر تاوانبارم نەکردوون لە دروستبونی ئەو بارە ناهەموارەی کە گەلی فەلەستینی تیایە و ئەو ناکۆکییانەی کە لە نیوان بەشەکانی ناویاندا هەیە، هەروەها کە بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێز ئاماژەم بۆ دروشمی (هیچ دەنگێگ لەسەرو دەنگی شۆڕشەوە نییە) کردووە، هەروەها لە باسکردنما دەربارەی ئەو نشوستی و تێکشکاندنە سەربازیانەی کە ڕژێمە عەرەبیەکان تێی کەوتوون لە شەڕەکاندا لەگەڵ ئیسرائیلدا لە کتێبەکەمدا باسمکردون، کە بۆتە هۆی ئەوەی لە باتی فەلەستین ڕزگار بکەن بەڵکو بوونە هۆی داگیرکردنی هەموو خاکەکەی و بەشێکیش لە خاکی وولآتانی تر، کە هەندێك لەو ڕەخنانە ئەگاتە ئاستی ئەوەی وەك خیانەتکارێك لێم بدوێن، یا وەکو ئەوە وایە بەلای هەندێك لە چەپەکانەوە بەرگری لەو ڕژێمە سەرکوتکارانە بکرێت کە لەشکرەکانیان لە بری ئەوەی لەشکری بەرگرین لە نیشتمان کە ئەوە ئەرکی سەرەکییانە، بونەتە لەشکری سەرکوتکردنی هاوولآتیان بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی دەسەلآتداران و دەستگرتنی زیاتر بە سەر هەموو دامەزراوەکاندا و بۆ چاوبەستیش دروشمی جەنگی گەلپارێزیان بەرزکردۆتەوە، ئایا ئەمانە جێگەی تیاڕامان نین ؟! بەلآم ئەوەی پەیوەندی بە بەکارهێنانی دەستەواژەی (جیهانی عەرەبی) یەوە هەیە لە جێگەی (نەتەوەی عەرەب) لە لایەن منەوە ئەوەناگەیەنێ کە من ئینکاری لە عەرب بوونی خۆم بکەم، من لەم ڕووەوە پێویستیم بە شایەتیی

کەس نییەو تێکۆشانی خۆم و حزبەکەم بە درێژایی ماوەیەکی دورو درێژ لـە پێنـاوی کێشـە عەرەبیەکانـدا بەتایبـەتی لـە لوبنـان و لـە بۆنـە نێودەوڵەتیەکانیشدا شایەتی ئەو مەسەلەیەن، عەرەب بونیشم کـە شـانازی پێوە ئەکەم ئەوە ناسەپێنێ بەسەرما کە تیورو هەڵوێست و دروشمێك پیـادە بکەم کە بەلامەوە ڕەگەزپەرستانەن و هیچ مانایەکیان نییە، کە زۆرێك لـەو ڕێکخراو و حزب و جولانەوە گەلییانە زیاتر لە نیو سەدەیە پیادەی ئەکـەن، لە ڕاستیدا ویستومە ئاماژە بەوە بکەم کـە کۆمـەڵگای جیهـانی عـەرەبی هەمەجۆرە  لە قەومیەت و ئاین و ڕۆشنبیریا، هەڵەیـەکی گەورەیـە کـە وا نەڕوانینە کۆمەڵگای عەرەبی و ئەکەوینە ئەو سیاسەتە هەلانەوە کە ڕژێمـە سەرکوتکارەکانی ناوچەکە پیادەیان کردوە، کە لە ڕاستیدا مەسەلەکە ئـەوە نییە کە دان بە بونیاندا نەنێین بەڵکو لە ڕوانگەی خۆ بە نەتـەوەی گـەورەتر زانینەوە مامەڵەیان لەگەڵـدا ئەکـەین و ئەیانچەوسـێنیتەوە و سـەرکوتیان ئەکەین، لێرەوە ئەڵێم پێویست بەوە ئـەکات بـە ئاگـاوە ئـەو دەسـتەواژانە بەکاربهێنین بەمەرجێ ئەو هەمەجۆرییەی کۆمەڵگای تیا پشتگوێ نەخرێت، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بـە ئامـاژە کردنـەوە هەیـە بـۆ بەرەنگاربونـەوە لـە فەلەستین و لوبنان  بە شێوەیەکی تایبەتی، ئەمەوێ بەوانە بڵێم کە نـایزانن یا لە بیریان چۆتەوە کە بەرەنگاربونەوە مێژوویـەکی پڕشـکۆ و دورو درێـژی هەیـە لـە لوبنـان  کـە شـیوعیەکان پێشـڕەو و سەردەسـتەی بـوون، بەرەنگاربونەوەیەك کە مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە  بـۆ بیسـتەکان و سـیەکانی سەدەی ڕابردوو کە شیوعیە لوبنانیەکان  بە شێوازی جیا جیـا هاوبەشـبوون تیا، لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵ برا سوریەکانییان سالانی ١٩٢٥-١٩٢٧ و لە قۆناغی دووەمـدا لەگـەڵ بـرا فەلەسـتینیەکانییاندا سـالانی ١٩٢٩ تـا ١٩٣٩، ئەم هاوبەشییەی شیوعییەکان نموونەیەکی دیـاری بەرەنگاربونـەوە

بوون، بەلاّم مێژووی تازەی بەرەنگاربوونەوە لە لوبنـان سـالّی ١٩٤٨ ە کـە شیوعیەکان لە لەشکری ڕزگاریخوازدا لە گەلّ سوریەکان و فەلەستینیەکان و لوبنانیە نیشتمانپەروەرکاندا بەشدار بوون، کە قوربـانی زۆریـان پێشـکەش کرد لەو قەسابخانانەدا کـە زایۆنیزمـەکان دروسـتیان کردبـوو لـە خـواروی لوبنان، کوشتارخانەی (حولا)ی خوارو لە هـەمویان خوێنـاویتر و دڕندانـەتر بوو، کە چل کەسی تیا شەهید بوو لە ناویاندا هەندێکیان لـە شـیوعییەکان بوون، لە قۆناغـەکانی دواتریشـدا بەرەنگاربونـەوە ی دوژمنـی ئیسـرائیلی هەربەردەوام بوو،شیوعییە لوبنانیـەکانیش ڕۆلّـی سـەرەکیان تیـا ئـەبینی، سەرەتا شانبەشانی بـەرەنگاری فەلەسـتینی لـە سـەرەتای درووسـتبونیا و دواتریش (حەرەسی شەعبی) کە شـیوعیە لوبنانیـەکان لەسـالّی ١٩٦٩ دا دایانمەزراندبوو، تا ئەگاتە (بـەرگری نیشـتمانی لوبنـانی) کـە شـیوعیەکان ڕایانپەڕاند بەرەوڕوی داگیرکەرە ئیسرائیلیەکان لە لوبنان  لە سـالّی ١٩٨٢ دا، کە پالّەوانێتی و دەسکەوتە مێژوییەکانیان بە ناوی ئەو جەبهەیەوە  لـە یاد ناکرێت، ئەمەویّ بە هاوڕیّ چەپەکانم بلّێم کە بەرەنگاری حـزب الله بـۆ ڕزگارکردنی خاك لەسالّی ٢٠٠٠ دا ڕۆلّێـك بـو ئینکـاری لـیّ نـاکریّ کـە شێوازی لەشکرکێشی وەرگرتبوو بە پێچـەوانەی شـەڕی لایـەنگران کـە لـە ئەوروپا ناسراوە لە کاتی جـەنگی جیهـانی دووەمـدا لـە بەرەنگاربونـەوەی نازیەکاندا، حـزب الله پالّـەوانێتیان نوانـد وزۆریـش کـەوت لەسـەر گـەلی لوبنانی،بەتایبەتی لە خـواروی خـۆراگردا، ئەمـەویّ ئـەوە بلّـێم دەربـارەی بەرەنگاربونـەوە، بەرەنگاربونـەوەی هـەموو گـەلان بـۆ ڕزگـاری نیشـتمان کۆتاییەکەی بەوە دێت (ئەگـەر ڕزگاریـان بەدەسـت هێنـا – وەرگێـڕ) کـە دەولّەتێك دائەمەزرێنن بە هەموو دامەزراوە سەربازی و سیاسیەکانیەوە کە ئەرکیان بەرگری کردن ئەبێت لەو نیشتمانە، من ئەمە لە سـالّی ٢٠٠٠ وە

دووباره ئەکەمەوە لە هەموو نوسینەکانم و کتێبەکانمدا، کە داوای ئەوە ئەکەم با بەرەنگاربونەوەی حزب الله بۆ ئەو مەبەستە بێت،واتە پاراستنی نیشتمان و شانبەشانی هەموو هێزە نیشتمانپەروەرەکانی تر بێت و بەرەنگاربونەوە بۆ پاراستنی نیشتمان بکاتە ئەرکی سەرەکی خۆی، کاتێك کە نیشتمان بەرەو ڕوی دوژمنێکی سەرەکی ئەبێتەوە، بەرەنگاربونەوەیەکی شەعبی شانبەشانی سوپاو لە ژێر ڕکێفی دەوڵەتدا، ئەمەش وا ئەکات کە لە ئەرکە نیشتمانییەکە دوا نەکەوێت، پێداگرتن لە سەر ئەم خاڵە هەست کردنە بە ترسناکی بوونی بەرەنگاری بە شێوازی تایەفەگەری و مەزهەبی لەدەرەوەی دەوڵەت،ئەمەش وایکردوە کە ببێتە هۆی دابەشبوونی لوبنان ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە وەك ڕۆڵی مێژوویی لە ڕزگاریخوازیدا کە پێویستە ببێتە سەرچاوەیەك بۆ یەکێتی لوبنانیەکان و حکومەتەکەی و شانبەشانی هەموو لوبنانیەکان پارێزگاری دەوڵەت و یاساو مافی هاونیشتمانی و وەك یەکی و دادپەروەری بین، بە جیا لەمانەش مەسەلەی بەرەنگاری و بەرەوڕوبونەوە ئەرکێکی بنەڕەتی و زانستی تایبەتە بە لوبنان لە حاڵی ئێستایدا کە پێویستی بە ئەقڵێکی گەورەو کراوە هەیە و بەرپرسیارێتیەکی نیشتمانییە بە تایبە تی کە شێوازێکی تەحەداو ڕکەبەرایەتی لە خۆ گرتوە، کە پێویستە ناوەڕۆکی بەرەنگاری لەخۆ بگرێت بە پێی ئەو مانایەی کە هەیەتی و ڕێز لە پاڵەوانەکانی بگیرێت و بیانپارێزێ و وەك بیروباوەڕ و وەك پرۆسە لەو پیاهەڵپژانە ناوخۆییە دەرچێت و دەرچێت لە بازنەی یەکتری بە خائن سەیرکردن .

تەوەری شەشەم : لە گفتوگۆکاندا هەندێك دەربارەی دیاریکردنی خەسڵەتەکانی ئەم سەردەمە قسەکراوە، لەگەڵ چۆنیەتی تێگەیشتن لە ڕژێمی سەرمایەداریی گڵۆباڵ وسەقامگیر، باوەڕناکەم ئێمە پێویستمان

بەوەبێت  هەوڵ بدەین قەناعەت بەیەکتر بکەین کە سەرمایەداریی گلۆبـاڵ و دەست ڕۆشتوو بە هەموو پێکهاتەکانییەوە ئەمڕۆ دەسـتی بەسـەر جیهانـدا گرتووە و یاری بە پاشەڕۆژی مرۆڤایەتییەوە ئـەکات، هـەروەها پێویسـتمان بەوەش نییە بۆ یەکتری بسەلمێنین کە ئەو سەرمایەدارییە گلۆبالـە ئـەنجامی تێکشکانە بەردەوامـەکانی خـۆی ئـەدا بـە کـۆڵی زوربـەی خەڵکانـدا لـە سەرانسەری جیهاندا، بە تایبەتی لە وولاٌتە هەژارەکان، ئـەو تێکشـکانانەی کە هەمووومان ئـەیزانین و لێـی شـارەزا بـووین و بـە بـەردەوامی دووپـات ئەبێتـەوە وەك ئـەوەی کـە لـە کتێبـەکانی مـارکس و مارکسـیە کلاسیکییەکاندا خوێندومانەتەوە، ئەم قسانە ڕامانئەکێشێت کە بڵێین ئێمە لە ئاستی خۆمانەوە وەك چـەپ لـە لێکۆڵینەوەمانـدا دەربـارەی ڕاپـەڕینی چەپ  و دەربازبوون لە و نەهامەتیانـەی کەچـەپ و ڕۆڵـی چـەپی پـەراوێز خستوە، بەوردی و زانستیانەو واقیـع بینانـە بڕوانینـە خەسـڵەتەکانی ئـەم سـەردەمەی کـە سـەرمایەداریی زۆر دڕندانـە دەسـتی بەسـەردا کێشـاوە، هەروەها زانستیانە و واقیع بینانە ورد بڕوانینە چۆنیەتی ئـەوەی کـە چـەپ ڕۆڵـی خـۆی لـەم سـەردەمەدا وەربگرێتـەوە، لـەناو سـەردەمەکەدا نـەك لەدەرەوەی، لەبەر ئەوە هەرخویندنەوەیەك بۆ ئـەم سـەردەمە واقیـع بینانـە نەبێت و پشتی بە خەیاڵ ودالغە بەستبێت ئەوا زۆر بـە ئاسـانی خاوەنـەکی بەرەو ئەوە ئەبات کە وابیر بکاتەوە کە سەرمایەداریی فشەڵەو بە هۆی ئـەو نەهامەتیانەوە کە دێنە ڕێی هـەر لەخۆیـەوە ئـەڕوخێت، ئـیتر ئـەم خـەیاڵ پلاٌوانـە وا تێئەگـەن یەکسـەر ئـەمان دێـن وشـوێنی ئەگرنـەوە، بـەمجۆرە سۆشیالستیی ڕۆڵی خۆی لە مێژوودا وەرئەگرێتەوە، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیـە نەك تەنها هەڵەیە بەڵکو ترسناکیشە بۆسەر ڕۆڵی چەپ و پێگەی چەپ  لـە تێکۆشانیدا بۆ گـۆڕین، جـا لەبـەر ئـەوەی کـە بیرکردنـەوەکانیان دورە لـە

ڕاستیەوە و ئەبێتە هۆی کەوتنیان بە خێرایی و لە ئەنجامیشدا ئەبێتە هـۆی بێهیوایی و ڕوخانیـانی بەدەمــەوە ئـەبێت، مــن لــە خویندنەوەکەمـدا بـۆ جیهــانی ســەردەم و گۆڕانکاریــەکانی و ئاڕاســتە جیاوازەکــانی لــەو گۆڕانکاریانەدا بانگی چەپەکان ئەکەم بۆ گەڕان بەدوای هەڵسانەوەیەکدا بە پێی ئەو مەرجە مێژووییانەی کە سـەردەمەکە ئەیخوازێت،لـەدەرەوەی ئـەو وەهم و درووشمانەی کە ناوی چەپی شێواندوە و باوەڕپێکردنی لـە دەسـتداوە لە لای گەلان.

ئەمە هەندێك لەو بیروڕایانەبوو کە لەلام دروست بوو لــە ئـەنجامی ئـەو گفتوگۆیانەی کە لەسەر کتێبەکەم کرابوو دەربارەی هەڵوێستی من، جـەختم لەسەر ئەو لایەنانە کردبوو کە جیاوازییان هەبوو لە گەڵ بۆچونەکانی مندا، هەروەها سوپاسی ئەوانەش ئەکەم کە لەگەڵما هاوڕا بوون لە زۆر ڕووەوە،کـە هەندێکیان لە منیش باشتر بۆ مەسەلەکان چـوبوون، بـە تایبـەتی ئەوانـەی لەگەڵمدا وەستابونەوە بۆ گرنگیدان بە داڕشـتنەوەی سیاسـەتێك پەیوەسـت بەڕۆشنبیریی و ڕەوشتەوە و دەربـازبوون لـە ڕەگەزپەرسـتی و هەلپەرسـتی، بۆزیاتر ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و وزیاتر پێداگرتن لەسەر ڕزگاربوون لـە کۆیلایەتی بە شێوازە نوێکەی .

من وای دائەنێم ئێمە لەسـەرەتای ڕێگـەداین بـۆ هەڵسـانەوەی چـەپ و ڕزگـارکردنی لـەو نەهامەتیانـەی کـە تیایـەتی، ئێمـە پێویسـتمان بـە تازەکردنەوەی ڕێچکەیەك و ئەو مەرجانەیە کە ئامادەمان ئەکات بۆ ئەوەی لەدەرگایـەکی فراوانــەوە بچـینەوە ژورەوە نـەك لــە ڕێگـەی تەسـك و تەنگەبەرەوە، بۆ گەشتن بەو ئامانجانەی کە پڕۆژەی چەپ ئەیخوازێ بۆ گۆڕان لە وولاتەکانمانـدا، ئەمــەش وا ئـەخوازێت کـە بـەردەوامبین لـە گفتوگـۆدا دەربارەی پێکهاتەکانی چـەپ بـە هـەمو شـێوازەکانیەوە، هـەروەها هـەوڵ

